رۆمان

# شەوانی ئێریڤان






کەمال سەعدی

ڕۆمان

# شەوانی ئێریڤان



کەمال سەعدی

هەرێمی کوردستان
٢٠٢٣

١٤ ×٢١ سم
سەعدی، کەمال سەعدی
رۆمانی شەوانی ئێریڤان / کەمال سەعدی/ پێداچوونەوەو رێنووس:
سابیر رەشید / **چاپخانەی دانیشفەڕ** ٢٠٢٣.
١٨٤ لاپەڕە.

**ناوی کتێب:** شەوانی ئێریڤان
**بابەت:** رۆمان
**دانەر:** کەمال سەعدی
**دیزاینی ناوەرۆك و بەرگ:** سەرباز
**پیتچنین:** نووسەر خۆی
**رێنووس و هەڵەچنی:** سابیر رەشید
**چاپخانە: تاران**
**چاپ:** چاپی یەکەم، تاران ٢٠٢٣
**تیراژ:** ٥٠٠ دانە
**نرخ:** (٤٠٠٠) دینار
**شوێنی چاپ : چاپخانەی دانیشفەڕ- هەولێر**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٦٦) سالی (٢٠٢٣)ی پێدراوە

## ناوەرۆک

# باغی شار

ئێــوارە بــوو، لەگەڵ ئەمــجەد مەنــدیل لە نــاو بــاخچەکە دانیشتبووم، فەرهاد کە منی بینی، شوێنی خۆی گواستەوە و هاتە لامان دانیشت: ئەو هەرچەندە تەمەنی لە سەرووی حەفتا ساڵیدا بــوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا کەسـێکی بە زەوق و رۆمانسیـ بــوو، بەڵام لە بەر ئەوەی لە خانەوادەیەکی دەولەمەند بوو، بۆیە ناوە لە بەر چاو ون دەبوو و گەشتی بۆ دەرەوەی وڵات دەکرد. گوێی لەوە نەبوو ئەو وڵاتەی کە بۆی دەچێت، پێشتر بینیویەتی، یاخود نا، بەلایەوە گرنگ ئەوەیە شوێنی رابواردنی خۆشی لێبێت و پڕبێت لە ژنی جوان. هەرچەند گەشتیاران زیاتر لە وەرزی هاویندا گەشت دەکەن، بەڵام ئەو پێچەوانەی گەشتیاران، کاتێکی دیاریکراوی بۆ گەشتکردن نەبوو. هەر کاتێك ئارەزووی بکردبا گەشتی دەکرد، بە تایبەتی لە مانگی رەمەزاندا گەشتی دەکرد و دەیوت (ئەو شوێنانەی بۆیان دەچم خەڵکەکەی موسڵمان نین و نازانن رۆژوو گرتن چیە، لەوێ ئازاد دەبم).

زەرفێکی بە دەستەوە بوو، بەرزی کردەوە و رووی لە من کرد و وتی: دەزانی ئەم زەرفە چی تێدایە؟

وتم: نازانم چی تێدایە.

دەستی خستە ناو زەرفەکە و هەندێك بازن و ئەنگوستیلە و ملوانکەی لە ناو دەهێنا، دایە دەستم و وتی: ئەو شتانەم کڕیوە، لەگەڵ خۆم دەیانبەم بۆ ئەرمینیان بە دیاری دەیدەمە هاوڕێ ژنەکانم.

زەرفەکەم لێ وەرگرت و سەیری نرخی شتەکانم کردن کە لە سەر پارچە کاغەزێکی بچووك لە سەریان نووسرابوون نرخەکانیان بە یۆرۆ بوو، زۆر گران بوو، پێم وت: چۆن دڵت دێ ئەو دیارییە گرانبەهایانەیان بۆ ببەیت؟

بە پێکەنینەوە وتی: وا نیە کە تێی دەگەی.

وتم: ئەدی چۆنە؟

وتی: هاوڕێیەکم هەیە، لەنگەی ئەورووپی دەفرۆشێت، هەرجارێك لە ئەورووپا باری بۆ دێت، پێم وتووە ئەم جۆرە شتانەم بۆ دابنێت. بە نرخێکی زۆر کەم لێی دەکرم، لەگەڵ نرخی شتەکانی سەر عەرەبانەکانی شێخەڵا جیاوازیێکی ئەوتۆی نیە.

منیش وتم: دیارە بە نیازی بەم زوانە گەشت بکەیت؟

وتی: دوێنێ پاسپۆرتەکەم دایە کۆمپانیای پاندا، بۆ وەرگرتنی ڤیزەی ئەرمینیاو دوو بارەی ئێران.

منیش وتم: ڤیزەی ئێران بۆ؟

وتی: ئەمجارە لە ئێرانەوە بە ڕێگای وشکانی دەڕۆمە ئەرمینیا.

وتم: بێزار نابیت ڕێگای دوو وڵات ببڕیت تا دەگەیتە ئەرمینیا؟

وتی: زانیاریم لە سەر کۆکردۆتەوە، لە مەرزی حاجی ئۆمەرانەوە تا شاری ئێریڤان دوانزە بۆ سیانزە کاتژمێر دەبێ، حەزدەکەم شارەکانی ئێرانیش ببینم.

ئێمە لەو قسانەدا بووین، نەوزاد دۆخین و عیزەدین چاو حیز هاتن و لامان دانیشتن. نەوزاد دۆخین کە چاوی بە بازن و

ئەنگوستیلەکان کەوت، رووی لە فەرهاد کرد و پێی وت: دەڵێی بە نیازی گەشتکردنی بۆیە ئەم دیاریانەت کڕیوە؟

فەرهادیش وتی: داوای ڤیزەی ئێران و ئەرمینیام کردووە، بگەڕێتەوە دەڕۆم.

نەوزاد دۆخین کە ئەمەی گوێ لێ بوون رووی لە من کرد و وتی: بۆچی ئێمەش نەچین؟

منیش وتم: دوو مانگ نابێت لە ئەرمینیا گەڕاومەتەوە، بەڵام لە بەر دڵی تۆ دێم.

ئاماژەی بۆ عیزەدین چاو حیز کرد و وتی: عیزەدین چاو حیزیش لەگەڵمان دێت.

منیش وتم: لە ئەرمینیا ئەوم بینی، لەگەڵ هاوڕێیەکی هاتبوو، زۆربەی ئێواران لە مەیدانی کۆماری یەکتریمان دەبینی. پێم خۆشە لەگەڵمان بێت. کە وام وت، عیزەدین چاو حیز وتی: شەرەف مەندم لەگەڵ ئێوە گەشت بکەم.

ئەمجەد مەندیل کە زانی هەر سێکمان گەشت دەکەین و ئەو ماوەیە بە تەنیا دەمێنێتەوە وتی: منیش لەگەڵتان دێم.

ئیتر ئەوەبوو رۆژی دواتر هەر چوارمان چوینە کۆمپانیای پاندا و پاسپۆرتەکانمان دانێ بۆ ئەوەی ڤیزەی ئەرمینیاو دووبارەی ئێرانمان بۆ وەربگرن.

# بەڕێکەوتین

دوای ئەوەی ڤـیزەی ئـێرانی بـۆ چـوون و هـاتنەوە و ڤـیزەی ئەرمینیامـان وەرگـرت، بـۆ رۆژی دوایی پـێش رۆژهەڵات چـووینە تەرمینـاڵ و بە پـاسی کۆمپانیـای لاوان چـووینە مەرزی حـاجی ئۆمەران.

هەندێك خواردنی وشك و پێداویستی ترمان لەگەڵ خۆمان برد، تا لەوێ خۆمان خواردن ئامادە بکەین.

پێش ئەوەی بەڕێ بکەوین، تەلەفۆنم بۆ محەمەد کۆسە کرد و پێم وت کە پێش نیوەڕۆ لە مەرز ئامادەبێت. محەمەد کۆسە خەڵکی شـاری خـانێ بـوو، ئۆتـۆمبێلێکی بیجـۆی سـالۆنی هەبـوو، لە مەرزی تەمەرچینی ئێرانی ئیشی دەکرد. گەشتیارانی لە مەرز هەڵدەگرت و بۆ شـارەکانی تـری ئـێرانی دەبـردن. لە بەر ناشـیرینییەکەی و بێ مـووییەکەی، شـوفێرەکانی مەرز پێیـان دەوت مـحەمەد کۆسـە، هەندێکیشـیان بە مەیمـون بانگیـان دەکـرد. بەڵام وێـڕای ئەو ناشیرینییەشی کەسێکی ئێسك سووك و خوێن شیرین بوو، بە قسە خۆشەکانی زوو دەچووە ناو دڵان.

کـاتژمێر دەی بەیـانی گەیشـتینە مەرزی حـاجی ئـۆمەران، تـا پاسـپۆرتەکانمان مـۆرکرد و جانتاکانیـان پشـکنین و هەردوو مەرزی حاجی ئۆمەران و مەرزی تەمرچینمان بڕی، کاتژمێر یانزەی لادا.

کە لە هەولێر بەڕێ کەوتبووین، نانی بەیانیمان نەخواردبوو، بە محەمەد کۆسەم وت: کە گەیشتینە شاری ورمێ، لابدە ریستورانتێك، نانی نیوەڕۆ لەوێ دەخۆین.

ئەویش وتی: تا دەگەینە شاری خانێ زۆری نامینێ بۆ نیوەڕۆ، لەوێ لادەدەینە ریستورانتێك، تکەی مریشك و کەبابی باشی هەیە، نانی نیوەڕۆ لەوێ دەخۆین، چونکە تا دەگەینە شاری ورمێ نزیکەی سێ کاتژمێرمان پێ دەچێت.

نەوزاد دۆخینیش بیرۆکەکەی پێ باش بوو، وتی محەمەد راست دەکات، تا دەگەینە ورمێ خۆمان پێ راناگیرێت. باشترە لە خانێ نانەکەمان بخۆین، ئینجا بە ئیسراحەت بۆ سنووری ئەرمینیا بەڕێ بکەوین.

لە محەمەد کۆسەی شوفێرم پرسی وتم: لەگەل خۆپیشاندان لە دژی رژێمی ئێران لەچیدان؟

وتی: لەو رۆژەوەی ژینا ئەمینی دانیشتووی شارۆچکەی سەقز لە رێکەوتی ٢٠٢٢/٩/١٣ لە تاران بە بیانووی نەگونجاوی حیجابەکەی لە لایەن پۆلیسی- ئادابی حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران دەستبەسەرکرا و بە هۆی ئەشکەنجەو لێدان کەوتە نەخۆشخانە و دوای سێ رۆژ لە رێکەوتی ٢٠٢٢/٩/١٦ لە نەخۆشخانەی کەسرا لە تاران گیانی لە دەستدا، بەو هۆیەوە خەڵکی لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی ئێران، رژاونەتە سەر شەقام و دروشمی (ژن، ژیان، ئازادی) یان لە دژی رژێم بەرز کردۆتەوە . لەو رۆژەوە تا ئێستا خۆپیشاندانەکان بەردەوامن و پیاوەکانی رژێمیش بە تایبەتی هێزی پاسداران کەوتوونەتە گیانی ئەو خەڵکە و بریندار و کوژراویش هەیە.

منـیش وتـم: ئێـوە چی دەکەن، لە پەرچە کـرداری پیـاوانی رژێـم ناترسێن؟

وتی: من بەش بە حاڵی خۆم لە ترسی شەرەف و نامووسی خۆم، هاوسـەرەکەم و منالەکـانم بـردۆتەوە مـاڵی خەزورم و هەموومـان لەوێ کـۆدەبینەوە. ئەگەر رووداوێـکی نەخـوازراویش رووبـدات، بە هەموومان روو بە رووی دەبینەوە.

ئەوەبـوو، بە دەم قسـەکردنەوە گەیشـتینە شـارۆچکەی خـانێ، دوکان و شوێنە بازرگانییەکان کراوە بوون و ناو بازاڕ لە قەڵەباڵغیان جمەی دەهات.

بە محەمەد کۆسەی شوفێرم وت: بەر لەوەی بەڕێ بکەوین، لە هەولێر پێیان وتین (چونتان بۆ ئەرمینیا بە ناو خاکی ئێران لەم کات و سـاتەدا شـتێکی بـاش نیـیە، گشـت کەنالەکـانی راگەیانـدن بـاسی خۆپیشاندانی جەماوەری دەکەن و دەڵێن بارودۆخی ئەمنی ئێران لەو پەڕی خراپیـدایە و لە هەر چرکەیەکـدا دەتەقێـتەوە). کەچی ئەوەی ئێمە دەیبینین، لێرە ژیان ئاساییە و هەر کەسێك خەریکی ئیشوکاری خۆیەتی.

ئەویـش وتی: میـدیاکان هەنـدێك زێـدەڕۆییان تیـا کـردووە، بـارودۆخی ئەمـنی بەو رادەیە خـراپ نـیە، کە ئەوان بـاسی دەکەن، سـەرەتا بە رۆژیـش خۆپیشـاندان دەکـرا، بەڵام ئێسـتا تەنهـا بە شـەو خۆپیشاندان دەکرێت.

بەم شێوەیە گەیشتینە سەنتەری بازاڕی خانێ، محەمەد کۆسە ئۆتـــۆمبێلەکەی لە بەردەم ریســـتورانتێك راگـــرت و وتی: ئەم ریسـتورانتە خـواردنی خـۆشی هەیە، بە تـایبەتی تـکە و کەبـابەکەی وەکو تکەو کەبابی هەولێرە، نانی نیوەڕۆ لێرە دەخۆین و دواتر بەڕێ دەکەوین.

منیش وتم: لێرە بۆ سەر سنووری ئەرمینیا چەند کاتژمێرمان پێ دەچێت؟

وتی: ئەگەر ڕووداوێکی نەخوازراو نەیەتە پێشمان، دوای شەش کاتژمێری تر دەگەینە جێ.

نانی نیوەڕۆمان خوارد و بەڕێکەوتین. کە گەیشتینە شاری ورمێ، نەچووە ناو شار، بە ناوچەیەکدا ڕۆیشت، بە گەورەیی لێی نووسرابوو (بلو). نەوزاد دۆخین کە چاوی بە تابلۆی نووسینەکە کەوت، ڕووی لە محەمەدی شوفێر کرد و پێی وت: چما بە شەقامی بەردەم بلووەوە دەچینە ئەرمینیا؟

ئەویش وتی: دیارە پێشتر هاتوویت بۆ ئێرە؟

وتی: هاوڕێیەکم خانوێکی لێرە هەیە، چەند جارێك منی داوەت کردووە، ئەم شوێنە ژنی چێژ فرۆشی لێیە، جارێك بە تەنیا هاتم، هاوڕێیەکەم لێرە نەبوو، ژوورێکم گرت، خاوەن ماڵەکە لە نهۆمی خوارەوە بوو، ژوورێکی لە نهۆمی سەرەوە پێدام. چەند ژنێکی لە بەر دەست بوو، پێی وتم (ئەقلت کامەیان دەگرێت، بیبە ژووری خۆت و سێکسی لەگەڵ بکە).

منیش وتم: ئەوەی تۆ باسی دەکەیت، لە ئەورووپاش نییە، تەنانەت لە یانەکانی شەوانیشدا ژنە چێژفرۆشەکان لە شوێنی کارکردنیان کاری لەشفرۆشی ناکەن.

ئەویش وتی: تا نەچیت بڕوا ناکەیت، منیش یەکەم جار کە چوومە ئەوێ، سەرم سوڕما، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت ئەو شوێنە ڕێك وەکو گوندی لوبنانی لای خۆمانە، زۆرێك لە ژنانی ئەو شوێنە خەریکی کاری لەشفرۆشین.

دووری نێوان شاری ورمێ و (سەلماس) حەفتاو پێنج کیلۆ مەتر بوو، بە دەم قسەکردن و گاڵتەو گەپەوە، نەمانزانی ئەو ماوەیە چۆن تەواو بوو، دوای ئەوێ گەیشتینە شارۆچکەی (خوی) ئەو شارۆچکەیەش سی و پێنج کیلۆمەتر لە شاری سەلماسەوە دوور بوو. کە گەیشتینە ئەوێ، شوفێرەکەمان هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو وتی: نزیکەی دوو ساڵ لەم شارۆچکەیە سەرباز بووم.

منیش وتم: لە شەڕی عێراق و ئێران؟

وتی: من لە تەمەنی ئێوە نیم، کە شەڕی ئێران و عێراق رویدا مێرد منداڵ بووم.

منیش وتم: کە ناوی سەربازیت هات ژنت هێنابوو؟

وتی: چاك بوو ژنم نەبوو، دەنا بۆم زۆر زەحمەت دەبوو.

دوای ئەوە گەیشتینە شارۆچکەی (جلفا) کە چل و دوو کیلۆمەتر لە شارۆچکەی (خوی) دوور بوو. تا گەیشتینە ئەوێ، لە بەر تەسکی شوێنەکە، قاچەکانم رەق ببوون، بە محەمەدی شوفێرم وت: ئەگەر دەزانی زۆرمان ماوە بگەینە مەرزەکە، لە شوێنێك رابگرە، هیچ نەبێ ئاوێکی سارد و چایەك بخۆینەوە.

ئەویش وتی: شەست و پێنج کیلۆمەترمان ماوە تا بگەینە مەرزی ئێرانی (خود ئافرین).

نەوزاد دۆخینیش وتی: تا چایەك دەخۆینەوە و پشوێکی کورت دەدەین، بۆ نوێژی عیشا دەگەینە جێ.

محەمەدی شوفێریش وتی: تا دەگەنە شاری (ئێریڤان) کاتژمێر دوانزەی شەو رەت دەبێت.

نەوزاد دۆخینیش رووی لە من کرد و وتی: دەترسم تا دەگەینە (ئێریڤان) شوێنی حەوانەوەمان دەست نەکەوێت.

منیش وتم: شتی وا چۆن دەبێ.

وتی: گوێت لی نەبوو، کە لەگەڵ جۆرج قسەمان کرد، وتی لە بەر هاتنی بە لێشاوی هاوڵاتیانی رووسی بۆ ئەرمینیا، نرخی شوێنەکانی حەوانەوە گران بووە و بە زەحمەتیش دەست دەکەوێ.

منیش وتم: تۆ بڵێی لە ترسی سەربازی و شەڕی ئۆکرانیا رووسەکان رایان کردبێت؟

وتی: بۆ نا، ئەی لە بیرتە سەربازە کوردەکان لە کاتی شەڕی عێراق و ئێراندا لە سەربازی رایان دەکرد، زۆر کەسیش عێراقیان بەجێ هێشت و لە رێگای ئێران و تورکیاوە چوونە ئەوروپا.

وتم: وایە، ئەو کاتە من سەرباز بووم، کاتێك مەشقمان تەواو کرد و یەکەی سەربازییەکەمان گواسترایەوە بۆ بەرەکانی جەنگ، لە شاری ئەهواز، رامکرد، خۆم و هاوسەرەکەم ویستمان لەگەڵ قاچاغچییەکان بە رێگای تورکیا بچینە ئەوروپا، بەڵام لە نیوەی رێگا پەشیمان بوومەوە و ماوەیەکی زۆر لە گوندەکانی کوردستان مامەوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەوکات من عەریف فەسیل بووم و شوێنم باش بوو، بۆیە بیرم لە راکردن نەدەکردەوە.

من لە تەنیشت شوفێر دانیشتبووم، عیزەدین چاو حیز و ئەمجەد مەندیلم لێ دیار نەبوو، ئاورم لە پشتەوەی خۆم دایەوەو وتم: عیزەدین چاو حیز تۆ و ئەمجەد مەندیل بۆ قسەیەك ناکەن؟

هەردووکیان ورتەیان لێوە نەهات.

قسەکەم دووبارە کردەوە، نەوزاد دۆخین وتی: عیزەدین چاو حیز و ئەمجەد مەندیل لە حەوت باری خەودان، ئاگایان لە هیچ نییە.

محەمەدی شوفێریش وتی: بە ئاگایان بێنە، تۆزێکی تر لە جلفا لادەدەینە ریستورانتێك ، پشوێکی کورت دەدین و دەستیش بە ئاو دەگەیەنین.

نەوزاد دۆخینیش بە دەنگی بەرز وتی: لە خەو هەستن پشوو دەدەین.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: تەنها چاوەکانم لە سەر یەك دانابوون، خەوم لێ نەکەوتبوو، ئاگام لێ بوو باسی شەڕی عێراق و ئێرانتان دەکرد.

منیش وتم: ئەی بۆ پێت نەوتین ئەوکات تۆ چیت دەکرد؟

وتی: خۆزگەم بەوکاتی، گەنج بووم، لە شاری بەغداد شوفێری تایبەتی موستەشارێکی فەوجی خەفیفە بووم، کۆشکێکی گەورەی لە گەڕەکی زەیوونە هەبوو، زۆربەی کات لەوێ ژیانی بە سەر دەبرد و جاروباریش دەگەڕایەوە گوندەکەی.

منیش وتم: ئەوە یەك گوێم لێ بێت یەکێك خۆزگە بە کاتی شەڕی عێراق و ئێران بخوازێت. شتی وا چۆن دەبێت، خەلکی بە هۆی ئەو شەڕە نەگریسە مالیان وێران بوو، هەزاران سەرباز لەو شەڕەدا گیانیان لە دەست دا و کوژران.

بە پێکەنینەوە وتی: وەکو وتم لە گەڕەکی زەیوونە لە مالی موستەشارەکەم بووم، پیاوانی ئەو گەڕەکە زۆربەیان ئەفسەر و پلەداری سەربازی بوون، درەنگ دەگەڕانەوە، هەندێکیان ژنەکانیان تەواو نەبوون، چاویان دەگێڕا. منیش ئەوکاتە کوڕێکی قۆز بووم،

وەکو ئێستا دەموچاوم چرچ و لۆچاوی نەبوو، ژنیشم نەهێنابوو، رۆژ نەبوو لەگەڵ ژنێك لەو ژنانە نەخەوم.

منیش وتم: ئەوە لۆیە بەو تەمەنەش داناکەسێیت و هەر خەریکی مێ بازیت.

عیزەدین چاو حیزیش هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی: خۆزگەم بەو کاتی، وەکو ئێستا نەبووم، بەبێ حەب کێرم هەڵدەستا، جاری وا هەبوو بە رەپێك سێ گانم دەکرد و تەقەی سەرم دەهات.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: وەی لەو درۆیەی، ئاژەڵ بە ئاژەڵێتی خۆی کە گانێکی کرد، کێری دەنیشێتەوە و گانی تری پێ ناکرێ. درۆیەك بکە رێی تێ بچێت!

ئەویش وتی: تۆ هەقتە بڕوا نەکەیت، چونکە نەخۆشی شەکرەت هەیە و کێرت لە دەبل کوژاوەتەوە.

ئەمجەد مەندیل قسەکانی عیزەدین چاو حیزی پێ خۆش نەبوو، رووی لە من کرد و وتی: ئەگەر لە بەر تۆ نەبا لەگەڵ ئەم عیزەدین چاو حیزە نەدەهاتم.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ناوی خوا بێنن، سەڵەوات لێبدەن، ئێمە هاتووین جەوێکی خۆش بگۆڕین خۆ بۆ شەڕ نەهاتووین.

ئەمەی وت و رووی لە محەمەدی شوفێر کرد و پێی وت: تۆ باسی خۆت بۆ نەکردین، ئەوکات چیت دەکرد؟

ئەویش وتی: ئەوکات ناوی سەربازیم نەهاتبوو، شوفێری تراکتۆر بووم، لەو گوندانەی رۆژهەڵات زەویم بۆ خەڵك دەکێڵا و لەگەڵ کیژۆڵان رێکخەم دەکرد.

منیش وتم: ڕێکخە چیە؟

وتی: ماڵتە، چۆن نازانی ڕێکخە چیە؟

نەوزاد دۆخینیش وتی: منیش نازانم.

محەمەد کۆسەش وتی: مەبەستم لێخشاندنە. ئەم دەختە ناوی تەنها بۆم لێدەخشاندن و خۆم پێ ڕەحەت دەکردن.

عیزەدین چاو حیزیش بە پێکەنینەوە وتی: وەزعی من لە تۆ باشتر بوو، من تابنیم بۆ پاڵ دەدان، ئاوەکەشم بۆ تێ دەکردن.

منیش وتم: ماڵتان بە قوڕ نەگیرێ، ئێوە چیتان کردووە، ژن و کچتان نەهێشتووە و عەدمتان کردوون.

ئەمەم وت و محەمەدی شوفێر ئۆتۆمبێلەکەی لە بەردەم ریستورانتێك ڕاگرت و وتی: فەرموون دابەزن، چایەك دەخۆینەوە و دوای پشوێکی کورت بەڕێ دەکەوین. ئەگەر خودا هیچ قەزاو بەڵایەکمان بە سەر نەهێنێ، کاتژمێر حەوتی شەو دەگەینە جێ.

## بەرەو شارۆچکەی خودا ئافەرین

شـــارۆچکەی خـــودا ئـــافەرین شەســـت و پێـــنج کیلـــۆمەتر لە شارۆچکەی جلفا دوورە و کەوتۆتە سەر سنووری ئەرمینیا.

دوای کاتژمێرێــك گەیشــتینەجێ و چــوینە مەرزی (نــوردوز) ی ئێرانی، چوینە شوێنی پشکنینی جانتاو نیشانکردنی پاسپۆرتەکانمان. لە هەولێرەوە هەندێك زەخیرە و گۆشت و پەنیری قوتوومان لەگەڵ خۆمـان هێنـابوو، لە شـوێنی پشـکنینی جانتاکان، کارمەنـدی پشـکنین کە چـاوی بە کیسـەی بـرنجەکە کەوت، وتی: نـازانن هێنـانی زەخـیرە قەدەغەیە؟

منـیش وتـم: تەنهـا پێـنج کیلـۆ بـرنج و دوو کیلـۆ سـاوارمان بـۆ پێداویستی خۆمان لە هەولێرەوە لەگەڵ خۆمان هێناوە.

کیسە برنجەکەی برد و وتی: ئێستا دەتوانن بڕۆن.

عـیزەدین چـاو حـیز زۆر هەوڵی لەگەڵـدا کە رازی بکات، بەڵام بێ سوود بوو.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: ئەو برنجەمـان لە هەرێـمی کوردسـتانەوە هێناوە، لە ئێران نەمانکڕیوە، بۆچی لێمان دەگێڕنەوە؟

کارمەندی مەرز زۆر بێباك بوو، هەر وەڵامیشی نەدایەوە.

ئەمــجەد مەنــدیلیش وتی: خۆتــانی لەگەڵ مانــدوو مەکەن، نایداتەوە، چاوی لێیە بۆ خۆی بیبات، پارەیان زۆر بێ نرخ بووە، ژیانیـان قـورس بـووە، ئەو کیسـە بـرنجە بـۆ ئەوان پـارەیەکی زۆر دەکات، بۆیە بردی، دەنا ساواریش ئازووقەیە، چونکە هەرزانە، بەلایەوە نەچوو.

بەم شـێوەیە جانتاکانمـان هەڵگـرت و بەرەو مەرزی ئەرمینیـا بەرێکەوتین.

لە مەرزی ئەرمینیـــا لە کـــاتی پشـــکنین و نیشـــانکردنی پاســپۆرتەکانمان، کاتێـك ئەفســەرەکە چـاوی بە ڤـیزەی وڵاتی ئازربایجان کەوت لە ناو پاسپۆرتی عیزەدین چاو حیز، بە تورەییەوە وتی: بۆچی چوویتە ئازربایجان؟

ئەویش وتی: بۆ گەشتیاری چوومە ئەوێ.

ئەفسـەرەکە گومـانی هەبـوو، بـۆیە سـین و جـیمی لەگەڵ کـرد و بەرێی نەدەکرد.

کە زانیم خەریکە کێشەمان بۆ دروست بێت، چوومە پێشەوە و پاسپۆرتەکەی خۆمم دایە دەستی و پێم وت: ئێمە هاورێی یەکین، بە یەکەوە بـۆ ئازربایجـان رۆیشـتووین، ئـێمە هەقمـان بە سـەر سیاسـەت و نـاکۆکی نێـوان ئێـوە و وڵاتی ئازبایجـان نـیە، چـۆن بـۆ گەشتیاری چووینە ئەوێ، وەهاش بۆ وڵاتی ئێوە هاتووین.

کە وام پـێ وت، قەنـاعەتی بە قسـەکانم هـات و پاسـپۆرتەکانی ئێمەی نیشانکرد و وتی: بەخێربێن بۆ وڵاتەکەمان.

کە چووینە دەرەوە، عیزەدین چاو حیز پێی وتم: بۆچی پێیان ناخۆشە بۆ ئازربایجان رۆیشتووین؟

وتم: هەردوو وڵاتی ئەرمینیا و ئازربایجان ماوەیەکی زۆرە شەڕ و ناکۆکییان لە سەر ناوچەی (ناگۆرنی قەرەباغ) هەیە، هەردوو لا داوای مولکدارێتیی دەکەن. ئەرمینیا بە پاساوی ئەوە کە زۆربوی دانیشتووانەکەی ئەرمەنین، دەیەوێ بیگەڕێنێتەوە سەر وڵاتەکەی، ئازربایجانیش بە پاساوی ئەوە کە خاکەکەی بەشێکە لە ئازربایجان، بۆیە داوا دەکات بگەڕێتەوە سەر خاکەکەی.

بەم شێوەیە، تاکو ئێستا ئەم ناکۆکیە لە نێوان هەردوو وڵات کۆتایی پێ نەهاتووە و چەندین جار هێزی سەربازییان لە دژی یەکتری جوڵاندووە و سەدان سەربازی یەکترییان کوشتووە و بەو هۆیەشەوە خەلکانێکی زۆری ناوچەکە شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە و هەندێکیان بۆ ئازربایجان کۆچییان کردووە، هەندێکیش بۆ ئەرمینیا.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئەم دوو وڵاتە کامیان لە سەر هەقن؟

وتم: ئەوەی من بیزانم، ئەم ناوچەیە، دەکەوێتە ناو خاکی ئازربایجان، زۆرینەی دانیشتوانی ئەرمەنین، بۆیە ئەرمینیا پشتگیرییان دەکات.ئەویش وتی: ناوەکەی لە چیەوە هاتووە، بۆچی پێی دەڵێن ناگۆرنی قەرەباغ؟

وتم: وشەی ناگۆڕنی لە زمانی رووسی بە مانای بەرزاییەکان دێت، وشەی قەرەباغیش لە زمانی ئازەریدا بە مانای باخچەی رەش دێت. بەڵام ئەرمەنیەکان تەفزیلی ناوە ئەرمەنیە کۆنەکەی دەکەن و پێی دەڵێن (ئەرتساخ).

ئەویش وتی: ئەی وشەی ئەرتساخ لە چیەوە هاتووە؟

وتم: ئەم وشەیە لە ناوی یەکەمین پاشای ئەرمەنییەکان (ئەرتاکسیاس) ی یەکەم سەرچاوەی گرتووە، کە لە سالی ١٩٠- ١٥٩ پێش زایین، پاشای ئەرمەنیەکان و دامەزرێنەری مەملەکەتی ئەرمینیای گەورەیە.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: لە کەیەوە ئەوانە شەڕو ململانێیان لە سەر ئەو ناوچەیە دەست پێ کردووە؟

وتم: لە سالی ١٩٨٨ پێش هەلوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت ئازربایجانیەکان و ئەرمەنییەکان لە سەر مولکدارێتی ئەو ناوچەیە بەگژ یەکدا چوون و دوای شەڕو پێکدادانێکی خوێناوی لە سالی ١٩٩٤ ئاگربەستیان ڕاگەیاند، بەلام تاکو ئێستا نەگەیشتوونەتە ڕێککەوتنێکی کۆتایی، بۆیە ناوە ناوە بەگژ یەکدا دەچنەوە و هێز بەرامبەر یەکدی دەجولێنن. ڕەگ و ریشەی ئەم ناکۆکییە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە سەدەیەك، کاتێك ناوچەی ناگۆرنی قەرەباغ مەیدانی کێبڕکێ بوو بۆ سەپاندنی هەژموون لە نێوان ئەرمەنیەکان و ئازەرییە تورکەکان.

کە وام وت، عیزەدین چاو حیز وتی: ئەوە لۆیە کە لە ئازربایجان بووم، خاوەنی شوقەکەمان وتی: (نەکەن سەردانی ناگۆرنی قەرەباغ بکەن، ئەو ناوچەیە پڕە لە مافیا و چەتە و ڕێگر، تووشی کێشە دەبن).

منیش وتم: کاتێك گەشتم بۆ ئازربایجان کرد، لە مەرزی (ئەستارە) ی ئێرانەوە بە ئۆتۆمبێل چووینە باکۆی پایتەختی ئازربایجان، شوفێرەکەمان پیاوێکی ئەرمەنی بە تەمەنی چەپرەو بوو، وتی: لێرەش کورد هەیەن لە ناوچەی ناگۆرنی قەرەباغ دەژین و زۆربەیان مافیاو چەتەن، حکومەتی ئازربایجان دەسەلاتی بە سەریانەوە نییە، وەکو هەرێمەکەی ئێوە خۆیان حوکمڕانی دەکەن)،

منـیش پـێم وت: (ئـێمە لەگەڵ ئەوانـدا جیاوازیمـان هەیە لەگەڵ ئەوان، بە پێی دەستوور مافمان پێ دراوە، ناوچەکەمان هەرێمێکی فیدرالیە لە چوارچێوەی عێراقی فیدراڵدا).

عیزەدین چاو حیزیش وتی: چاك بوو منت لەگەڵ نەبووم، دەنا دەمـو ددانیـان دەشـکاند، چـۆن نامـاقولی دەکـات و دەڵێ ئەو کوردانەی ئەوێ چەتەو مافیان.

کە لە مەرز چــووینە دەرەوە، لە بەر دەرگــا جۆرجمــان بیــنی، چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد. من جۆرجم لە گەشتی پێشووم بۆ ئەرمینیا ناسی، پیاوێکی ئەرمەنی بوو، بە رەچەڵەك سووری بوو، خەڵکی شاری عفـرین بـوو، لە دوای شـەڕی نـاوخۆی سـوریا هـاتبوو بـۆ ئەرمینیـا و لەوێ دەژیا.

لەگەڵ جـۆرج قسـەمان کـرد، وتی: بە چـل درام کە دەکاتە پەنجا دۆلاری ئەمریکی دەتانبەم بۆ شاری ئێریڤان.

ئەوەبـوو لەگەڵی بەڕێ کەوتـین، لە سـەر زنجـیرە چیـای ئـارارات هـاتینە خـوارەوە، تـا گەیشـتینە شـاری (ئێریڤـان) پـێچە و بەرزی و نزمیمان تـووش هـات. جـۆرج ئامـاژەی بە چیای ئارارات کـرد و وتی: ئەم زنجیرە چیایە لە ناو خاکی تورکیاوە دەست پێ دەکات و بە خاکی ئـێران و ئەرمینیـا و ئازربایجانـدا تێـدەپەڕێت. لە تورکیـا بە چیـای (ئاگریێ) نـاوزەد کـراوە، بەرزتـرین لـووتکەی لە نـاو خـاکی تورکیـایە و دەگاتە (٥١٦٥) مەتـر، لە نـاو خـاکی ئەرمینیـاش بەرزیەکەی دەگاتە (٥١٣٧) مەتر. ئەم زنجیرە چیایە بەوە ناسراوە کە چیایەکی گرکانیی خەولێکەوتووە و بەفـر داپۆشـیوە، کەوتۆتە نـاوجەرگەی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە پارێزگای (ئاگریێ) بە دووری شانزە کیلۆمەتر لە سنووری ئێرانەوە و سی و دوو کیلۆمەتریش لە سنووری ئەرمینیاوە.

جۆرج بەردەوام بوو لە باسکردنی چیای ئارارات و وتی: چیای ئارارات پەیوەستە بە چەند ئایینێکەوە، کە بە پێی کتێبی سەرەتای ژیان، کەشتیەکەی نوح لە سەر لووتکەی ئەم چیایە وەستاوە. هەروەها لە نێو ئەرمەنیەکاندا پێگەیەکی بەرزی هەیە، بەو پێیەی لە پێش جەژنی کریسمسەوە پەیوەندی بە نەتەوەی ئەرمەنیەوە هەیەو لە ناو کتێبی پیرۆز ناوی هاتووە. ئەم چیایە هێمای سەرەکی نەتەوەیی ئەرمینیایە و ئەرمەنیەکان بە چیایەکی پیرۆزی دەزانن. لە ئەدەب و هونەری ئەرمەنیدا بە شێوەیەکی بەرچاو دەردەکەوێت. هەروەها ئایکۆنی بیرۆکەی گەورەی ئەرمەنیە لەگەڵ کەشتی نوح کە لە سەر ئاڵای ئەرمەنستان وێنا کراوە.

زنجیرە چیایەکی زۆر بە سام بوو، لە هەندێك شوێن بە ناو هەوردا دەڕۆیشتین، لە بەر تەمومژ هیچ شوێنێکمان لێ دیار نەبوو، دڵمان لەناو دەستمان دابوو، لەوە دەترساین شتێکمان لێ بێت، لە دڵی خۆمدا دەموت (ئەگەر ئەمجارە نەمرین قەت نامرین)، شوفێرەکەمان شارەزاییکی زۆری لە سەر ئەو ڕێگایە هەبوو، بۆیە بە وریاییەوە ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی و شلەژانی پێوە دیار نەبوو. نزیکەی چوار کاتژمێر بە ناو تەمومژدا تێپەڕین، لە ترسان موچڕکم پێدا دەهات. دوایی تەمومژەکە نەما و وردە وردە ئاسمان ڕۆن بۆوە و بەرچاومان رووناك بوو، دیمەنە جوان و دلڕفێنەکانی قەدپالی زنجیرە چیاکانی ئاراراتمان لێ بە دیار کەوت.

تا گەیشتینە شاری ئێریڤان کاتژمێر دووی سەر لە بەیانی ڕەتی دا. بەو کاتە درەنگە ئۆتۆمبێل لە شەقامەکاندا دەهاتن و دەچوون، تەنانەت سوپەر مارکێتە گەورەکان و یانەکانی شاوان و کۆفێکانیش ئاوەدان بوون.

بە شوفێرەکەمان وت: ئێمە تەنها دۆلارمان هەڵگرتووە، دەتوانی لە شوێنێك هەندێکمان بە دراوی خۆتان بۆ بگۆڕیتەوە؟

وتی: زۆربەی سوپەر مارکێتەکان شوێنی گۆڕینەوەی دراویان تیایە، ئێستا دەتانبەم بۆ سوپەر مارکێتێك و چەندی دەتانەوێ بۆتان دەگۆڕمەوە.

ئەوەبوو لە سەر رێگای خۆی لایدایە سوپەرمارکێتێکی گەورە و وتی: لەگەڵم وەرن، لێرە پارەکانتان بگۆڕنەوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: حەوت کاتژمێر شتێك کەمە لەناو ئۆتۆمبێلین، وەکو بت و سەنەممان لێ هاتووە، دەڵێی لە قالب دراوین، با هەندێك بە ناو سوپەر مارکێتەکەدا بسوڕێینەوە و سەیری کەلوپەلەکان بکەین و هەندێك پێداویستیش بکڕین.

ئەوەبوو دابەزین و لەگەڵ جۆرج چوینە سوپەر مارکێتەکە و هەر یەکی سێسەد دۆلارمان گۆڕیەوە.

کاتێك پارەکەمان وەرگرتەوە، جۆرجی شوفێر وتی: پێش ئەوەی رووسیا هێرش بکاتە سەر ئۆکرانیا، سەد دۆلاری ئەمریکی بە پەنجاو سێ درام بوو، بەڵام لەوەتی هێزەکانی رووسیا چونەتە ناو خاکی ئۆکرانیا، نرخی دۆلار دابەزیوە و تەنها چل و یەك درام دەکات.

چاومان بە شتومەکەکانی ناو سوپەر مارکێتەکەدا خشاند، نرخەکانیان زۆر گران بوو، لە چاو شتومەکی لای خۆمان، چوار تا پێنج بەرامبەر بوو.

عیزەدین چاو حیز رووی لە نەوزاد دۆخین کرد و وتی: پێم نەوتی لەوێ شت نایەتە کڕین، ئەگەر ئەو برە زەخیرە و خواردنی قووتی و چەرەزاتەمان لەگەڵ خۆمان نەهێنابا، دەبوو ئێستا دوو سەد دۆلاری پێ بدەین.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەگەر بە چاوی خۆم نرخی ئەو کاڵایانەم نەبینیبا، بڕوام نەدەکرد

منیش وتم: نرخی ئەو کاڵایانە لە ئازربایجان لە چاو ئێرە وەکو دیتنەوە وایە، لەبیرتە سەد دۆلارمان دەگۆڕیەوە بە سەد و حەفتا مەنات و هەموو شتێکی پێ دەهات.

نەوزاد دۆخینیش وتی: دە رۆژ من و تۆ و کاروان لەوێ ماینەوە، بێ دڵی خۆمان نەکرد، بە کەیفی خۆمان پارەمان خەرج دەکرد و هەموو شەوێکیش خواردن و خواردنەوە و رابواردنمان هەبوو، ئەوجا یەکی هەزار دۆلارمان خەرج کرد.

منیش وتم: بێ قەزابێ تۆ دەتوت خەلیفەکانی عوسمانی، هەر شەوی لەگەڵ دوو سێ ژن دەخەوتی، ئەوجا ئەوەندەت خەرج کردووەن من و کاروان تەنها دوو شەو ژنمان هێناو لەگەڵیان خواردمانەوە، کاروان بە دەنگە زوڵالەکەی گۆرانی بۆ دەوتین و منیش لەدوای دەموتەوە و ژنەکانیش بە دەم شەڕاب خواردنەوە وە سەمایان بۆ دەکردین.

ئەویش وتی: من تەنها چێژ لە سێکسکردن وەردەگرم، سەیرم بە تۆ دێت، لەگەڵیان دادەنیشیت و دەخۆیتەوە، وەکو توێژەری کۆمەڵایەتی دەیاندوێنیت.

منیش وتم، تۆ بە دوو خولەك کاری خۆتیان لەگەڵ تەواو دەکەیت، بەڵام من نزیکەی سێ کاتژمێر لەگەڵیان دەمێنمەوە و لاپەڕە شاراوەکانی ژیانیشیان پێ هەڵدەدەمەوە.

ئەویش وتی: نهێنی ژیانی ئەوان چ سوودێکی بۆت دەبێت؟

وتم: هەر ژنێك لەوانە، چیرۆکێکی خۆی هەیە، چێژ لە سەربردە و بەسەرهاتەکانیان وەردەگرم، نەك جەستەیان. ئەو هەزاران کیلۆمەتر رێگایە چۆن دەبڕم ئەگەر لە پێناو گوێبیستبوونی ژیانی ئەوان نەبێت. ئەوان دەبنە کەرەستەی رۆمانەکانم.

کە وام وت، بە پێکەنینەوە وتی: هەق وایە خەرجی ئێمە هەمووی لە سەر تۆ بێت، چونکە دەزانم من دەکەیتە پاڵەوانی رۆمانی داهاتوت و ئەوانیش دەکەیتە کارەکتەر تیایدا.

## ناتاشا

دوای ئەوەی پارەمان گۆڕیەوە، شوفێرەکەمان وتی: ئەدرەسی ئەو شوێنەتان لایە کە بۆی دەچن؟

منیش مۆبایلەکەم دەرهێنا و ئەو ئەدرەسەم پیشاندا کە پێشتر لە ناتاشام وەرگرتبوو.

شوفێرەکەمان وتی: ناتاشا دەناسم ژمارەی مۆبایلەکەیم لایە، ئەو خاوەنی شوقەکانی (GLENDEL HILZ 17) یە.

ئەمەی وت و بە مۆبایلەکەی خۆی پەیوەندی پێوەکرد و پێی وت: ئێمە لە ئێریڤانین، دوای پانزە خولەکی تر دەگەینە بەردەم باڵاخانەکە.

ئەمەی وت و رووی لە من کرد، وتی ئەو باڵاخانەیەی بۆی دەچین، شوقەکانی نوێن، بۆیە نرخیان لەوانی تر گرانترە.

منیش وتم: ئێمە لە سەر نرخەکەی لەگەڵی رێککەوتووین، کێشەمان نیە.

تا گەیشتینە جێ، بیرم لای ناتاشا بوو، لە بیری خۆمدا دەموت (دەبێ ئەو ناتاشایە ژنێکی چۆن بێت، تەمەنی چەند بێت، چۆن بۆتە خاوەنی باڵاخانەیەك لە ناو جەرگەی پایتەختی ئەرمینیا).

کاتێك کە گەیشتینە جێ، ژنێکی باڵابەرزی سوور و سپی، پرچێکی زەردی زێڕین، چاوەکانی شین وەکو ئاوی دەریا، تراکسودێکی پەمەیی خەوتنی لە بەر بوو، لە بەر دەرگای باڵاخانەکە چاوەڕێی دەکردین. کە چاوی بە ئێمە کەوت، دەتوت دە ساڵە دەماننناسێت، بە روێکی خۆش و زمانێکی شیرین پێشوازی لێ کردین و ئێمەی بردە بەردەم باڵاخانەیەك، لە سەر دەرگاکەی نووسرابوو (GLENDEL HILZ 17) و وتی: ئەم ئەدرەسە لە بیر مەکەن، چون بۆ هەر شوێنێك ئەمەتان لابێت، پیشانی هەر شوفێری تاکسیێکی بدەن دەتانهێنێتەوە بۆ ئێرە.

لە تەنیشت دەرگای باڵاخانەکە بۆردێکی ئەلیکترۆنی هەبوو، وەکو ئامێری ژمێرياری وابوو، وتی ئەم بۆردە بچووکە دەبینن؟

وتم: بەڵێ.

وتی: هەر کاتێك یەکێکتان لە بازار گەڕایەوە، دەست لە سەر ژمارە (B 25) دانێن لە ژوورەکەتان زەنگ لێدەدرێت و هاوڕێکەتان دەست دەخاتە سەر دوگمەیەك لە ژێر زەنگەکەوەیە، ئەو کات دەرگاکە بۆ خۆی دەکرێتەوە.

ئەمەی وت و چووینە ژوورەوە، بە سەرخەر بە سەرکەوتین بۆ نهۆمی شەشەم شوقەی ژمارە بیست و پێنج.

وەکو وتم ناتاشا ژنێکی ناسك و نازدار بوو، پێ نەدەچوو هاوسەرگیری کردبێت، مەمکەکانی قیت بوون، شەڕیان لەگەڵ چاوەکانی ئێمە دەکرد، زۆر سەرسام بووم بە جوانییەکەی، چاوم لێ بوو تۆقەمان لەگەڵ بکات، بە بیانووی تۆقەکردن، دەستە نەرم و نۆڵەکانی بگوشم. بەڵام ئەو لێمان نەهاتە پێشەوە، لە دوورەوە راوەستابوو.

دوای ئەوەی دەرگای شوقەکەی بۆ کردینەوە، ئێمەی بە ناو ژوورەکاندا گێڕا و یەك یەك ژوورەکانی پیشان داین و وتی: ئێرە هەموو شتێکی تیایە، وابزانن لە ماڵی خۆتانن، غازی ئێرە بە بۆری دابەش کراوە، هەر کاتێك ویستتان بچنە گەرماو لەگەڵ کردنەوەی بەلوعەکە بۆ خۆی دادەگیرسێت و ئاوەکە گەرم دەبێت. هەروەها تەباخەکەش هایدرۆلیکە پێویست بە چەرخ و شقاتە ناکات، دوگمەکەی بسوڕێنن بۆ خۆی دادەگیرسێت.

ئەمەی وت و داوای لێکردین کە مۆبایلەکانمانی بدەینێ تا پاسوۆردی ئەنتەرنێتەکەمان بۆ تۆمار بکات.

وتی: لێرە خزمەتگوزاری ئەنتەرنێت بە خۆڕاییەو هەر کاتێك بێنە ژوورەوە، مۆبایلەکانتان دەچێتە سەر خەت و دەتوانن ئەنتەرنێت بەکار بێنن.

کاتەکەی زۆر درەنگ بوو، کاتژمێر سێی بەیانی بوو، لە خۆشی دیتنی ناتاشا و دەنگە ناسکەکەی، خەومان رەویەوە.

نەوزاد دۆخین ئۆقرەی لێ بڕابوو، سەری هێنا ژێر گوێم و وتی: دەمەوێ دەستم بە سمتی دابێنم و ماچێکی لێ بکەم.

منیش وتم: کارێکی شێتانە نەکەیت، ئەوە شورەییە، کێ دەڵێ ناتاشا لەو ژنانەیە کە جەستەی خۆیان دەفرۆشن.

وتی: ئەم شەو خەوم لێ ناکەوێ ئەگەر دەست لە سمتی نەدەم و ماچی نەکەم.

منیش وتم: با ئابڕومان نەچێت، ئەو ژنە سیمای بە لەشفرۆش ناچێت، خانمێکی بە رێز و خاوەن شکۆ دیارە.

ئەویـــــش وتی: لەو وڵاتە ئەوروپیـــــانە زۆربەی شـــــوقەکان خاوەنەکانیان ژنن، بە لایانەوە ئاساییە داوای رابواردنیان لێ بکەیت.

منیش وتم: ئەو ژنە وەکو پیاو هەلس و کەوت دەکات، هێندە متمانەی بە خۆی هەیە، بۆیە بەم کاتە درەنگە لەگەل چوار زرتە زەلامی وەك ئێمە راوەستاوە.

ئەویـش وتی: پـێش بلاوبـوونەوەی ڤـایرۆسی کۆرۆنـا، لەگەل عـیزەدین چـاو حـیز چـوینە وڵاتی ئازربایجـان، لە شـاری بـاکۆ شوقەیەکمان بە کرێ گرت. خاوەنی شـوقەکەمان ژنێك بـوو، ناوی (ئیرادە) بوو، ئەو لە ناتاشا بە تەمەنتر بوو، بەڵام ئاکاری وەکو ئەو جوان بوو. تا من جانتاکەم بردە ژووری نووستن، عیزەدین چاو حیز ئەوی رازی کردبوو، لە سەر قەنەفەی هۆلەکە درێژی کردبوو دەیگا.

کە ئەم روداوەی بـــۆم گـــێڕایەوە، پێکەنیـــنم هـــات، رووم لە عیزەدین چاو حیز کرد و پێم وت: ئەوە راستە؟

وتی: ئـیرادە ژنـێکی تەڕ لـووس بـوو، وەکـو ناتاشـا نەبـوو، بە چاوەکانی پیاوی دەڕفاند، بۆیە داوام لێکرد گانم بداتێ.

منـیش بە پێکەنیـنەوە وتـم: ئەی چـۆنە ئێســتا وا بە رێــزەوە بەرامـبەر ناتاشـا راوەسـتاویت و وەکـو ئـیرادە لە سـەر پشـتی درێـژ ناکەیت؟

وتی: ئەو چیرۆکە سێ سال پێش ئێستا بوو، ئەوکات بە بێ حەبی هەوەس دەپەڕیـم، بەڵام ئێسـتا توانـای سێکسـیم لاواز بـووە، دەبێ یەك کاتژمێر پێشتر حەبی هەوەس بخۆم ئەوجا کێرم هەڵدەستێ.

منیش وتم: ئەی بۆ نەوزاد دۆخـین حەبیشی نەخـواردووە وا هـار بووە؟

وتی: نەوزاد دۆخـــین دە ســـاڵ لە مــن بچــووکترە، چــۆن بەو نێرەکەرە بەراورد دەکرێم.

لە بەر ئەو قسانە ئاگامـان لە ناتاشـا نەمـابوو، ئەویـش لە زمـانی ئـێمە تێنەدەگەیشـت، نەیـدەزانی چی دەڵێـین و بـاسی چی دەکەیـن، هەروای دەزانی بـاسی بـاشی و خــراپی شــووقەکە دەکەیـن، بـۆیە بەرامبەرمــان بە بێ دەنــگی وەســتابوو، چــاوەڕێی ئەوەی دەکــرد پارەکەی بدەینێ و بڕوات.

ئەمـجەد مەنـدیلیش وتی: برایـان زیـاتر ناتاشـا رامەگـرن، واز لەو قسە پڕوپووچانە بێنن، با پارەکەی بدەینێ و بە رێی بکەین، گوناهە زۆر خەوی دێ.

نەوزاد دۆخینــیش وتی: بـا گەرمـاوەکەم پیشــاندا، مــن لەگەڵی دەچــم تەماشــا دەکەم، نەوەك شــتێکی نــاتەواو بێــت و پەکمــان بکەوێت.

نەمزانی نەوزاد دۆخین چی لە ژێر سەردایە و بۆچی وا دەڵێ، ئەوە بــوو رووی لە ناتاشـــا کــرد و داوای لێ کــرد کە لەگەڵی بچێــتە گەرماوەکە و پیشانی بدات.

ناتاشــاش بە پێشیــ کەوت و بە یەکەوە چــوونە گەرمــاوەکە. ئـێمەش لە هـۆڵەکە راوەسـتابووین، لە ناکاو ناتاشـا دەنـگی لە سـەر نەوزاد دۆخـین بەرز کـردەوە و بە زمـانی ئینگلـیزی پـێی وت: عەیـب ناکەیت دەستم بۆ درێژ دەکەیت، من لەو ژنانە نیم کە تۆ دەتەوێ، ژنێکی خێزاندارم و پیاوی خۆم هەیە، تکایە جارێکی تر ئەم هەڵس و کەوتە دووبارە نەکەیتەوە.

ئەوەی راسـتی بێـت، منـیش لە نەوزاد دۆخـین خـراپتر بـۆ ناتاشـا لێـدرابووم، زۆر سەرسـام بـووم بە جـوانییەکەی، دەتـوت شـەنگە

بیـیە، بە لارو لەنـجە دەجـولایەوە، پـرچە زەردە زێـڕینەکەی وەکـو لقەکانی شەنگەبی بەسەر سمتیدا هاتبووە خوارێ.

پاش ئەوەی پارەی حەفتەیەك مانەوەمان پێی دا، نامەیەکم بە زمانی عەرەب نووسی و بە بەرنامەی گۆگل ترانسلێتەر بۆیم وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی، داوام لێی کرد ئەگەر لاری نەبێت ئێوارەیەك دەعوەتمان بێت و شەڕابمان لەگەڵ بخواتەوە.

کە نـامەکەی خوێنـدەوە وتی: مـن زۆر مانـدووم، بە ڕۆژ کـار دەکەم، بێ لە سەرپەرشـتی ئەم باڵاخـانەیە، تاکسـیم هەیە، ئەگەر ویستتان بچنە شوێنێك، تەلەفۆنم بۆ بکەن، لاتان ئامادە دەبم و بۆ کوێ بتانەوێ دەتانبەم.

سـەبارەت بە دەعـوەتەکەش، ڕووی تێکـردم و وتی: سوپاسـت دەکەم بۆ ئەم دەعوەتە، ناتوانم لێرە لەگەڵتان دابنیشم و مەشروب بخـۆمەوە، بەڵام لە بەر دڵی تـۆ ئەگەر ویسـتت تەلەفـۆنم بـۆ بـکە لەگەڵت دێمە یانەی دیسکۆ، لێرە یانەی دیسکۆی خۆشی لێیە، بە یەکەوە دەچـین، هەوایەك دەگـۆڕین، لەگەڵـت سـەما دەکەم و دەشخۆمەوە.

## Energy Club

ئێوارەی ڕۆژی دووەم لە گەشتەکەمان، تەلەفۆنم بۆ ناتاشا کرد و پێم وت: ئەمشەو کاتت هەیە لەگەڵمان بێیتە دیسکۆ؟

وتی: یانەی دیسکۆ کاتژمێر دەی شەو دەکرێتەوە، کە خۆتان ئامادە کرد زەنگم بۆ لێدەن لاتان ئامادە دەبم و دەتانبەم بۆ ئینێرجی کلاب، یانەیەکی خۆشی ئێرانیە، لە شوێنی دانیشتنیشتان نزیکە.

منیش وتم: تۆ دەعوەتی منیت، بە یەکەوە بیرە دەخۆینەوە.

وتی: بە یەکەوە سەماش دەکەین.

منیش وتم: من سەما نازانم.

وتی: زۆر ئاسانە فێرت دەکەم، لەوێ کچی جوانی زۆری لێیە، بە ئیشارەتێکی من هەموویان دەستت دەگرن و دەتبەنە سەر ستێج و لێناگەڕێن دابنیشیت.

عیزەدین چاو حیز لە نزیك من لە سەر قەنەفەیەك پاڵ کەوتبوو، کە گوێی لە قسەکانمان بوو، وتی: بۆچی لەگەڵ ئەو دەچن، پارەیەکی زۆرتان دەچێت، لەوانەیە مەشروبێکی زۆر بخواتەوە، ئەو کچە سەماکەرانەش بە خۆڕایی لەگەڵتان دانانیشن.

منیش وتم: خۆ ورگی تانکی ئاو نیە ئەوەندەی تێکات، زۆر زۆر دوو بتڵ، یان سێ بتڵ بیرە دەخواتەوە، یان بتڵێك شەراب دەخواتەوە.

ئەویش وتی: ئەگەر وابێت باشە.

منیش وتم: بۆچی تۆش لەگەڵمان نایەیت؟

وتی: من شەوان زوو دەخەوم، ئەگەر تا کاتژمێر هەشت و نیو نەخەوم تەندروستیم تێك دەچێت، بۆیە ناتوانم لەگەڵتان بێم، ئێوە بڕۆن کلیلی دەرگاش لەگەڵ خۆتان ببەن، بۆ ئەوەی کە گەڕانەوە لە خەو هەڵمنەستێنن و خۆتان دەرگاکە بکەنەوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەمجەد مەندیلیش لەگەڵمان نایەت، لێرە دەمێنێتەوە.

ئەویش وتی: بۆچی نایەت، خۆ وەکو من شەو زوو ناخەوێت.

نەوزاد دۆخینیش وتی: لە خۆی بپرسە بۆچی نایەت.

ئەمجەد مەندیل مۆبایلەکەی بە دەستەوە بوو سەیری تیکتۆکی دەکرد، کە گوێی لە قسەکان بوو، وتی: من نایەمە شوێنی وا، تاقەتی ئەو کچە سەماکەرانەم نییە وەکو مەڕ بمدۆشن.

نەوزاد دۆخینیش وتی: مادام ئێوە لەگەڵمان نایەن، تا ناتاشا دێتە دوامان و دەمانباتە دیسکۆ، با مێزەکە برازێنینەوە و بە یەکەوە بیرە بخۆینەوە.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: من بیرە ناخۆمەوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: لەگەڵمان دانیشە، تەنها زەڵاتە و فستق بخۆ.

ئەویش بە پێکەنینەوە وتی: قەیناکات لە بەر خاتری ئێوە دەشخۆمەوە.

منیش وتم: ئەوە بە راستیتە، لە کەیەوە دەخۆیتەوە؟

وتی: خراپ تێ مەگەن، مەبەستم ئێچ توو ئۆ یە.

عیزەدین چاو حیزیش بە پێکەنینەوە وتی: مادام ئێچ توو ئۆمان لەگەڵ دەخۆیتەوە، هەستە با بەیەکەوە مێزەکە ئامادە بکەین.

ئەویش وتی: ئێوە بیرە و شەراب دەخۆنەوە، خۆتان ئامادەی بکەن، من دەستی نادەمێ، گوناهبار دەبم.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: مادام وایە لەگەڵمان مەیە سەر مێز با بە هۆی ئێمەوە گوناهبار نەبیت، بڕۆ ژووری خۆت تەسبیحات بکە.

ئەمەی وت و هەندێك بتڵ بیرەی لە ناو سارد کەرەوەکە دەرهێنا و لە سەر مێزەکە دانا، هەندێك خیار و تەماتەشی هێنا و کردیە زەڵاتە و سێ هەناریش هێنا وتی: ئەم هەنارانە بکەمە دنك، یان هەروا لێی گەڕێم؟

منیش وتم: پێویست ناکات خۆتی پێ ماندوو بکەیت، ئێمە خۆمان دەیکەینە دنك.

بەم شێوەیە دوای ئەوەی مێزەکەمان رازاندەوە، بە یەکەوە سەری خۆمان گەرم کرد، من و عیزەدین چاو حیز هەریەکەمان

بتلێـك بیرەمـان خـواردەوە، بەڵام نەوزاد دۆخـین دوو بتـڵ بـیرەی خواردەوە.

بیرەکە خۆماڵی بوو، تام و چێژی لە لە بیرەی ساڵانی هەشتاکانی لای خۆمان دەکرد، بەڵام بتلی ئەوان یەك لیتری بوو، دوو بە قەدەر بتلی فەریدە بوو.

بە عیزەدین چاو حیزم وت: مەشروب خواردنەوە وانابێت، تۆ لە ناو تورکمانان گەورە بوویت، قۆریاتێکمان بۆ بڵێ.

ئەویش وتی: خـۆزگە دەمـزانی، لە ئێـوە زیـاتر حەزم لێـیە، نەوزاد دۆخـین بـا بـیلێ، مـاوەیەکی زۆر دوکـانی ڤیـدیۆی هەبـووە، گـۆرانی نەماوە گوێی لێ نەبووبێت.

نەوزاد دۆخینـــیش رووی لە مـــن کـــرد و وتی: لە بـــیرتە لە گەشـتەکەمان بـۆ ئازبایجـان مـن و تـۆ نەمانـدەزانی گـۆرانی بڵێـین، کاروان بە دەنگە زوڵاڵەکەی دانیشتنی شەوانی بۆ خۆش دەکردین و قۆریاتی بۆ دەوتین.

منیش وتم: یەکەم جار بوو ئەوم ناسی، پیاوێکی مەرد و دڵساف و خوێن شیرین بوو، هەرچەند پێشتر لە رادیۆ و تیڤییەکان گوێم لە گۆرانیەکانی بـوو بـوو، بەڵام لە نـزیکەوە بە خـزمەتی نەگەیشـتبووم. بەڵام ئەفسوس قەدەر رێگەی نەدا سەفەرێکی تری لەگەڵدا بکەم و خودا بۆ لای خۆی بردیەوە.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: خوا لێی خۆشبێ، ئەوە ژیانە، کەس تا هەتایە ناژیت، گرنگ ئەوەیە خەڵك لێت رازی بێت.

نەوزاد دۆخینـیش رووی لە مـن کـرد و وتی: ئەم عـیزەدین چـاو حیزە لە هەزار ئاوی داوە و قاچی تەڕ نەبووە، با هەندێك سەربردەی

خۆیمان بۆ بگێڕێتەوەن لە هەرەتی گەنجێتیدا چی کردووە و چۆن ژیانی بە سەر بردووە.

عەیزەدین چاو حیزیش وتی: بە هۆی ئەو موستەشارەی کە شوفێری بووم، کەسانێکی دەستڕۆیشتووی زۆرم ناسی، بە تایبەتی بەرپرسانی سەر بە دەزگای ئەمنی و حیزبی.بۆیە هێندەی نەبرد لە وەزیفەیەکی حکومی بە شوفێری دامەزرام و لە سەر راسپاردەی بەڕێوەبەری ئەمنی شاری هەولێر بوومە شوفێری سەرۆکی ئەنجوومەنی یاسادانان و ماوەیەك لەگەڵ ئەو مامەوە. دواتر هەر لە سەر راسپاردەی بەڕێوەبەری ئەمن گواسترامەوە بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی تەنفیزی و بوومە شوفێری سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی.

منیش وتم: بە حوکمی شوێنی کارکردنت و نزیکیت لەو کەسە گەورانە، لەوانەیە نهێنییکی زۆری ژیانی تایبەتی ئەوانت لا بێت.

وتی: سەرۆکی ئەنجوومەنی یاسادانانی لێ دەرچێت، ئەوانی تر کە کارم لەگەڵ کردوون هەر هەموویان ژن و کچەکانیان حیز بوون، کوڕەکانیشیان بە منداڵی فێری جگەرە کێشان و مەی خواردنەوە و رەفتاری ناشیرین بوون.

منیش وتم: ژنی یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەنجوومەنی تەنفیزی قسەی لە سەر بوو، بەڵام نازانم تا چەند راست بوو.

وتی: خۆزگە هەر قسە با، بە ئاشکرا گانی دەدایە بەرپرسەکانی ئەمن، پیاوەکەشی پێی دەزانی و بۆ بەرژەوەندی خۆی، خۆی لێ گێل دەکرد.

منیش وتم: هەر چوار ساڵ جارێك سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی دەگۆڕا، مەبەستت کامیانە؟

وتی: تەنها لەگەڵ دووانیان کارم کردووە، ئەوانیش هەردووکیان ژنەکانیان حیزبوون. یەکێك لەوانە، پێش ئەوەی ژنەکەی بهێنێت، دەستی لەگەڵ پارێزگاری شاری سلێمانی تێکەڵاو کردبوو، هەر زوو کچێنی خۆی لە دەست دابوو، کە هاوسەرگیری لەگەڵ سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی دەکات، تا ماوەیەك بەردەوام دەبێت لە داوێن پیسییەکەی.

منیش وتم: مالی ئەوان لە هەولێر و مالی پارێزگار لە سلێمانی، شتی وا چۆن دەبێ!

وتی: دواتر پارێزگاری سلێمانی گوێزرایەوە بۆ شاری هەولێر و لێرە بووە پارێزگار و بەمەش کارەکەیان ئاسان بوو.

منیش وتم: تۆ چۆن بەمەت زانی؟

وتی: هەموو کارمەندانی ئەنجوومەن و تەنانەت زۆر کەسی تریش بەو پەیوەندیە سۆزدارییەی نێوان ژنی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی و پارێزگاریان زانی.

منیش وتم: چۆن؟

وتی: سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی دوو ژنی هەبوو، کاتێك منالەکانی ژنی یەکەمی بە چیرۆکی خیانەتی زڕ دایکیان زانی، سیخوڕییان بە سەر دا کرد و ئەو گرتە ڤیدیۆییەیان دەستکەوت کە باوکیان لەگەڵ ژنە نوێیەکەی لە گەرماو بە یەکەوە گرتوویانە و تیایدا ژنەکەی لە بەردەم کامێرا دان بەوەدا دەنێت کە کاتێك گەنج بووە پەیوەندی سۆزداری و سێکسی۔ لەگەڵ پارێزگاری سلێمانی هەبووە و چەند جارێکیش هەولی داوە خۆی دوور بخاتەوە و کۆتایی بەو پەیوەندییە نا شەرعییە بهێنێت، بەڵام پارێزگاری سلێمانی

لە ڕێگای دەسەڵاتی خۆیەوە فشاری خستۆتە سەری و نەیهێشتووە لێی دوور بکەوێتەوە.

منیش وتم: تۆ ئەم گرتە ڤیدیۆیەت بینیوە؟

وتی: دەزانی تـۆ زۆر فەقـیر حـاڵی، دەڵـێی لەم شـارە نەژیاویـت، ناکات بڵێی نەم بینیوە؟

منیش وتم: لێت ناشارمەوە، ئەوکات من کارمەندی ئەمینداریێتی گشـتی شـارەوانی و هاوینەهەوارەکان بـووم، کە گـوێم لێ بـوو، بـڕوام نەکـرد. چـۆن پیاوێـك هەنـدە بێ حـورمەت دەبێ، بزانێـت ژنەکەی حیزە و لە بەر دەمیدا دان بە داوێن پیسی خۆیدا بنێت کەچی دەستی لێ بەر نەدات و لەگەڵی بژیت.

ئەویش وتی: نالێم هەموویان، بەڵام زۆربەی ئەو بەرپرسانەی کە کارم لەگەڵ کـردوونن گەواد و ژن حـیز بـوون، خۆیـان لە گـێلی دەدا. دەزانی بۆ؟

وتم: بۆچی؟

وتی: چونکە لە ڕێگەی ژنەکانیانەوە دەچوونە پێشەوە.

منـیش وتـم: کە گـرتە ڤیـدیۆکەی نێـوان سـەرۆکی ئەنجـوومەنی تەنفیزی و ژنەکەی بڵاو بۆوە، چی ڕوویدا؟

وتی: حکـومەت سـەرۆکی ئەنجـوومەنی تەنفـیزی لە پۆسـتەکەی بەخشی. و پلەیەکی تر بەرزی کـردەوە و وەك ڕاوێژکاری ئەنجـوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ شاری بەغداد گوێزرایەوە.

منیش وتم: تۆش لەگەڵی نەچویت؟

وتی: گەیانـدمە شـاری بەغـداد و چەنـد رۆژێـك لەوێ لەگەڵی مامەوە، بەڵام دوایی گەڕامەوە شاری هەولێر و ئامادە نەبووم لەوێ کاری لەگەڵ بکەم.

ئێمە لەو قسانەدا بووین، زەنگی دەرگا لێیدا، کە سەیری کاتژمێرم کـرد، کات دەی شـەو بـوو، وتـم: چەنـد بە خـێرایی کات رۆیشـت، لەوانەیە ناتاشا بێت، ئـێمەش خۆمـان ئامـادە نەکـردووە. ئەوەبـوو چـووم دوگمە کەم داگـرت، ناتاشـا لە بلنگـۆیەکە وتی: لە خـوارەوە چاوەڕێتان دەکەم ئامادەبن.

لە خوارەوە چاوەڕێتان دەکەم ئامادەبن.

بە خێرایی خۆمان گۆڕی و لەگەڵ نەوزاد دۆخین چوینە خوارەوە. ناتاشـــا لەگەڵ ژنێـــك لە بەر دەرگـــای باڵاخـــانەکە لە تەنیشـــت تەکسیێك راوەستابوون. دوای سڵاوکردن، ناتاشا ئێمەی بە ژنەکە ناسـاند وتی: ئەم خـاتوونە نـاوی (Anul) یە، مـن هەنـدێك کارم بـۆ پەیـدا بـووە، نـاتوانم لەگەڵتـان بـێم، ئەو لە جیـاتی مـن لەگەڵتـان دەبێت، هیوادارم بە دڵتان بێت.

(Anul) ژنـێکی ژنـێکی باڵا بەرز و خـڕو و چـاو جـوان بـوو، لە ژنی ئەرمەنی نەدەچـــوو، لەشـــولارێکی رێـــك وپـــێکی هەبـــوو، وەکـــو وەرزشەوانەکان قۆڵ و باسکی توند و تۆڵ بوو، تیشێرتێکی پەمەیی و پـانتۆڵێکی تەسـکی رەشی لە بەر بـوو، پـارچە شـاڵێکی رەشی بەسـەر شـانیدا دابـوو، هەنـدە جـوان بـوو، دەتـوت ماسـیيە. هەرچەنـد مـن حەزم دەکـرد لەگەڵ ناتاشا ئەو شـەوە پەمەیـیە بەیەکەوە لە یـانەی شەوان بەسەر ببەین، بەڵام لە بەر چوانیەکەی دەنگم نەکرد.

لەگەڵ خـاتوو (Anul) سـواری تەکسـیەکە بـووین و رۆیشـتین. دوای دە خـولەك شـوفێری تەکسییەکە لە بەردەم یانەیەی شـەوانی

(Energy Club) رایگرت و وتی: ئەم یانەی شەوانە، بە یانەی شەوانیی ئێرانی ناسراوە، چونکە زیاتر گۆرانی و موزیکی ئێرانی تیا لێ دەدرێت و یەکێکیشە لە خۆشترین یانەکانی شەوان لە ئێریڤان.

کە چووین یانەکە تازە کرابۆوە، تەنها ئێمە و کارمەندەکانی یانەکەی لێ بووین، بەڵام دوایی وردە وردە خەڵک هات و کورسییەکانی پڕ بوون. خاتو (Anul) لە تەنیشت من دانیشت و ئەو پارچە شاڵە لە سەر شانی بوو، هێنایە خوارەوە و لەشە سپی و تەنکەکەی بە نیمچە رووتی بەدیار کەوت، سوخمەیەکی پەمەیی خانە خانەی تەنکی لەبەر بوو، مەمکە بچۆڵانە خنجیلانەکەی، لەبەر سپی و تەنکییان، لە ناوە سوخمەکەی وەکو زیو دەتریسکایەوە. ئەو تیشێرتەی لەبەری بوو، لەبەر کورتییان هەموو زگی دانەپۆشیی بوو، وەکو ژنە هیندییەکان چوار پەنجە لەسەر ناوکی و تا سەر لێواری قوزە خڕ و پڕەکەی رووت بوو. دەستێکم خستبووە سەر سمتی و دەستەکەی تریشم خستبووە سەر شانی و ناوە ناوەش شۆڕم دەکردەوە ناو سینە و مەمکەکانی و بە نەرمی دەمگوشین.

مەیگێڕەکانی ئەوێ، هەموویان کچ بوون، جلی نیمچە رووت و موجەسەمیان لەبەر بوو، بە سەماکردن دەهاتنە لامان، بە دەست و پەنجە ناسکەکانیان خواردنەوەیان پێشکەش دەکردین. من و نەوزاد دۆخین دوو بتڵ بیرەمان داوا کرد، خاتوو (Anul) یش چارەگێک ڤۆدگا و ئاوی لیمۆی داواکرد.

پاش ئەوەی پێکەکانمان پڕ کرد، گڵاسەکەی بەرز کردەوە وتی: بە خۆشیتان. ناوە ناوەش لەگەڵ خواردنەوەی هەر پێکێکدان گڵاسەکەی لە گڵاسی ئێمە دەدا و هەمان وشەی دووبارە دەکردەوە.

من و نەوزاد دۆخین بەر لەوەی بێینە یانەکە بیرەمان خواردبۆوە، بۆیە قومی بچووکمان لێ دەدا و بە خێرایی نەدەڕۆیشتین. خاتوو

(Anul) یش دەیویست زیاتر بخۆینەوە، بۆیە زوو زوو گڵاسەکەی لە گڵاسی ئێمە دەدا و دەیوت: بەخۆشیتان.

پاش ئەوەی کورسییەکانی یانەکە پڕ بوون لە میوان و هیچ شوێنی بەتاڵ نەما، کچە سەماکەرەکانیش بە نمایشە سەرنج راکێشەکانیان دانیشتنەکەیان خۆشتر کردبوو، لەش و لاری ناسکیان لەگەڵ دەنگی موزیك و ئاوازی ئێرانیی دڵرفێن بە لار و لەنجە دەلەرییەوە. منیش وەکو سولتانی عوسمانی شانم بە شانی خاتوو (Anul) دابوو، هەرچەندە سەیری کچە سەماکەرەکانیشم دەکرد، بەڵام خەیاڵم هەر لای جەستە سپی و تەنکەکەی (Anul) بوو.

کچە سەماکەرەکان لە دەوروپشتم دەسوڕانەوە و هەندێکیشیان دەستیان رادەکێشام و بە زۆری دەیانبردمە سەر ستێج و سەمایان لەگەڵ دەکردم.

یەکێك لەو کچە سەماکەرانە ناوی (نانە) بوو، زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بوو، سترێژێکی رەشی تەنکی لەبەر بوو، گۆشتی رانەکانی لە ناو دیار بوو. چاوە رەشە جوانەکانی خستبووە ناو چاوەکانم و بە برۆ تەنکەکانیشی۔ ئیشارەتی دەدامێ، لە چاوەکانیدا دەمخوێندەوە کە دەیەوێ سەمای لەگەڵ بکەم.

خاتوو (Anul) کە هەستی کرد حەزم لێیە سەمای لەگەڵ بکەم، پێی وتم: دڵی مەشکێنە، برۆ سەمای لەگەڵ بکە.

ئەوەی راستی بێت لەبەر دوو هۆ دوو دڵ بووم، لەلایەك سەمام نەدەزانی، لەلایەکی تریشەوە لەوە دەترسام خاتوو (Anul) ئیرەییم پێ ببات و لە رقان ئەویش بچێتە ئامێزی پیاوێکی تر و لە دەستی بدەم. بەڵام خاتوو (Anul) خۆی دەستی گرتم و خستیە ناو

دەستی خاتوو (ئانە) و وتی: بڕۆنە سەر ستێج و بەیەکەوە جەوێك بگۆڕن.

نەوزاد دۆخینیش چاوی خستبووە ناو چاوەکانی (Anul) و چاوەڕێی دەکرد دەستی بگرێت و لەگەڵ خۆی بیباتە سەر ستێج و سەمای لەگەڵ بکات. بەڵام ئەو خۆی لێ بێ ئاگا کرد.

لەگەڵ خاتوو (نانە) هەندێك سەمام کرد و دوایی بەیەکەوە گەڕاینەوە لای (Anul) و بتلێك بیرەی بۆ داواکرد و بەیەکەوە خواردمانەوە.

کچێك لە نزیك نەوزاد دۆخین لە گۆشەیەکی یانەکە بە تەنیا دانیشتبوو، جگارەی لە دوای جگارە دەکێشا، بە تەمەن زۆر گەورە نەبوو، قەدو باڵایەکی باریکی هەبوو، دەتوت ناسکە تەرۆزیە، جووتێك بسکی باریکی بەسەر رووومەتەکانی شۆڕ کردبۆوە، تا ناو قەدی هاتبوون. دوو پاکەتی جگارە و چەرخێکی لەبەر دەمی خۆی دانابوو، هێشتا جگارەیەکی تەواو نەدەکرد، یەکێکی تری دادەگیرساند و دەیخستە سەر لێوە تەنکەکانی.

لەوە نەدەچوو لەگەڵ پیاو سەرجێی کردبێت، یان دەرچووبێت. کیژۆلەیەکی شەرمن و بە ویقار بوو. لە جوولەی چاوەکانی لەوە دەچوو، لەم ئیشەیدا نوێ بێت، هێشتان بە تەواوەتی رانەهاتبوو.

زۆر پێی سەرسام بووم، هەرچەند دەستێکم لەسەر شانی (Anul) بوو، دەستەکەی تریشم لە ناو دەستی (نانە) بوو. بەڵام بە تیێکی چاوەکانم چاودێریی (Anul) م دەکرد، لەوە دەترسام بەجێم بێلێت و لەگەڵ پیاوێکی تر سەما بکات.

نەوزاد دۆخین کە لە (Anul) و (نانە) بێ هیوا بوو، بە خشپە خشپ خۆی لەو کچە نزیك کردەوە، دوای خۆپێناساندن، داوای ژمارەی مۆبایلەکەی لێ کرد و تی: سبەی شەو لەگەڵم دێیت؟

ئەویش ژمارەی مۆبایلەکەی خۆی پێدا و وتی: هەر کاتێك ویستت لەگەڵت دێم.

کە ئەم دیمەنەم بینی، خۆم پێ نەگیرا و لە شوێنی خۆم هەستام، چومە لای، خۆم پێی ناساند و وتم: ناوت چیە؟

وتی: ناوم (ئەلیونا) یە.

داوای ژمارەی تەلەفۆنەکەم لێی کرد، وتی: ژمارەی مۆبایلەکەمم داوە بە هاورێکەت، لێی وەربگرە.

منیش ژمارەی تەلەفۆنەکەم لە نەوزاد دۆخین وەرگرت و پێم وت: لەوەتی هاتووین بۆ ئێرە، چاودێری ئەم کچە دەکەم، زۆر پاك و خاوێن دیارە، لەوە ناچێت بە تەواوەتی چوبێتە ناو ئەم ئیشە.

وتی: منیش وەکو تۆ زۆر سەرسامی کری و بێ دەنگیەکەی بووم، لەو بڕوایەدا نەبووم ژمارەی مۆبایلەکەی خۆیم بداتێ.

خاتوو (Anul) و (نان) کە منیان بینی لەگەڵ ئەو کچە قسە دەکەم، بە تورەییەوە تەماشایان دەکردم. کاتێك گەڕامەوە لایان، هەردووکیان رووی خۆیان لێم وەرگێڕا.

منیش بە (Anul)م وت: داوای لێبوردنت لێ دەکەم، ئەگەر بمزانیبا پێت ناخۆشە، نە دەچوومە لای.

ئەویش بە تورەییەوە وتی: ئەمشەو تۆ لەگەڵ منیت، جوان نیە لەگەڵم بخۆیتەوە و چاویشت لەسەر ژنێکی تر بێت.

داوای لێبوردنم لێی کرد و هەندێکیش پیامدا هەڵدا تا لێم عادز نەبێت، وتم: تۆ ژنێکی جیاوازی، شۆخ و شەنگیت، هیچ ژنێك جێگای تۆ ناگرێتەوە.

کە ئەمەم وت، پێکی ڤۆدگاکەی بەرز کردەوە و وتی: بە خۆشیتان.

منیش گلاسەکەم بەرز کردەوە و وتم: بە خۆشیتان.

لە کورسییەکانی بەرامبەر ئێمە هەندێك گەشتیاری ئێرانی دانیشتبوون، هەندێکیان گەنج بوون، هەندێکیشیان لە تەمەنی من دابوون. سەر مێزەکەیان پڕ کردبوو لە بیرەو شەراب و وێسکی، بە دەم خواردنەوە لەگەڵ دەنگی موزیك لە شوێنی خۆیان دەلەرینەوە، چەپلەیان لێ دەدا و بە زمانی فارسی گۆرانیان دەوت.

کوڕێکی گەنجیان لەگەڵ بوو، سەماکەرێکی زۆر شارەزاو لێهاتوو بوو، هێندە بە گەرم و گوڕی و جۆش و خرۆشەوە سەمای دەکرد، ئاو بە هەموو لەشیدا دەهاتە خوارەوە. کچە سەماکەرەکانیش زۆر پێی سەرسام بوون، سەمایان لەگەڵ دەکرد و هەندێکیشیان دەچوونە ئامێزی و لەگەڵ ئەو دەلەرینەوە.

زۆر بەو گەنجە ئێرانیە سەرسام بووم، لە بەر تەماشاکردنی ئەو، ئاگام لە (Anul) و (نانە) نەمابوو. ناوە ناوەش هەندێك لە کچە سەماکەرەکان دەهاتنە لام و دەستیان رادەکێشام بۆ سەر ستێج تا سەمایان لەگەڵ بکەم. هەرچەند لە دڵەوە زۆرم پێ خۆش بوو، بەڵام ئەفسووس سەمام نەدەزانی، بۆیە لە شوێنی خۆم هەڵنەستام.

گەنجە ئێرانییەکە کە منی بەم شێوەیە بینی، لەسەر ستێج هاتە خوارەوە و بە زۆری منی بردە ناو کچە سەماکەرەکان و بە هەموویان بازنەیەکیان دروست کرد و منیان خستە ناو بازنەکە، دەستێکم لە

ناو دەستی کچە سەماکەرێك بوو، دەستەکەی تریشم لە ناو دەستی ئەوگەنجە ئێرانیە بوو. دەتوت فەرمانی گرتنم بۆ دەرچووە، بە توندی دەستەکانیان گرتبووم و نەیان دەهێشت لە ناو سەماکە بچمە دەرەوە. نزیکەی نیو کاتژمێر سەمام لەگەڵ کردن، دوایی بە زۆری هاتمە دەرەوە.

نەوزاد دۆخینیش کە ئەمەی بینی، خۆی پێ رانەگیرا و هاتە سەر ستێج و دەستی کورە ئێرانیەکەی گرت و سەمای لەگەڵ کردن.

کە گەڕامەوە شوێنی خۆم، خاتوو (Anul) و (نانە) بە تورەییەوە هەستان و چوونە ناو سەماکەرەکان و لەگەڵ ئێرانیەکان سەمایان کرد.

منیش ئەوەم بە هەل زانی و خۆم گەیاندە لای (ئەلیونا) و بە فێڵی تۆقە کردن، دەستەکانیم توند گوشی و ماچێکیشم لە ناو دەمی کرد. داوام لێی کرد سەمام لەگەڵ بکات، رازی نەبوو، وتی: حەزم لە سەماکردن نییە.

منیش وتم: حەزدەکەی لەگەڵت دانیشم و هەندێك قسە بکەین؟

وتی: ئەوەم پێ خۆشە.

مۆبایلەکەم سیم کارتی ئەنتەرنێتی لە سەر بوو، دەرم هێناو لە رێگەی بەرنامەی (Google Translate) قسەکانی خۆم و ئەوم وەردەگێڕایە سەر زمانی عەرەبی و بەم شێوەیە نزیکەی نیو کاتژمێر بە یەکەوە قسەمان کرد.

لە قسەکانیدا دەرکەوت، دایك و باوکی ماوەیەکە لە یەکدی جیا بوونەتەوەو ئەویش لەگەڵ دایکی دەژی و خوێنکاری زانکۆشە. بە

ڕۆژ لە زانکـۆ دەخوێنێـت و شـەوانیش بـۆ بژێـوی خـۆی و دایـکی، ماوەیەکی کەمە دەستی بەم ئیشە کردووە، زۆربەی شەوان دێتە ئەم یانەیە، بە دەستە نەرم و نۆڵەکانی دەستی پیاوەکانی ئەم یانەیە گەرم دەکاتەوە و سێکسیان لەگەڵ دەکات.

دوای ئەوەی بـاسی ژیانی تـایبەتی خـۆی بـۆ کـردم، وتی: ژمـارەی منـت لایە، هەرکاتێك ویسـتت پەیوەنـدیم پێـوە بـکە، دێـمە لات و سێکسـت لەگەڵ دەکەم.منـیش وتـم: مـن نـامەوێ سـێکس بـکەم، تەنها حەزم لێیە لەگەڵت دابنیشم و بە یەکەوە بخۆین و بخۆینەوە و کەشێکی خۆش وەرگرین.

ئەویش وتی: تۆ پارەی خۆت دەدەیت، چۆنت پێ خۆش بێت وا دەکەم.

منیش وتم: لەم یەك دوو شەوە پەیوەندیت پێوە دەکەم.

ئەوەم وت و باوەشـم پێـدا کـرد و دەمـم خسـتە نـاو دەمی و لێـوە تەنك و گەرم و نەرمەکانیم ماچ کرد و گەڕامەوە لای نەوزاد دۆخین.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: بـاش بـوو منـیش چـوومە سـەر سـتێج. هەنـدێك لەوکـچە سـەماکەرانە هـاتنە دەسـتم و سـەمایان لەگەڵ کردم.

منیش وتم: کە تۆ چوویتە سەر ستێج، خاتوو (Anul) و (نانە) منیان بەجێهێشت. منیش ئەوەم بە هەل زانی و خۆم گەیاندە خاتوو (ئەلیونا) و ماچم کرد.

ئەویـش بە پێکەنیـنەوە وتی: بە منـیش دەڵـێی راسـپۆتین، ئێسـتا کاممـان راسـپۆتینین مـن یـان تـۆ؟ ژنە سـەماکەری ئەم یـانەیە نەمـا

سەمایان لەگەڵ نەکەیت و نەیان گەیتێ، تەنها ئەو ژنە مابوو، وا خۆت گەیاندە ئەویش و ماچت کرد.

وتم: دەزانی ناوی چیە؟

وتی: شتێکی وت، بەڵام لێی تێنەگەیشتم، شەرمیشم کرد لێی دوو بارە بکەمەوە.

وتم: ناوی (ئەلیونا) یە.

وتی: لەوە ناچێت کچێنی خۆی لە دەست دابێت، زۆر پاکیزە دیارە.

منیش وتم: قسەم لەگەڵ کرد، بە هۆی سەختی ژیانیەوە ماوەیەکی زۆر نیە دەستی بەم ئیشە کردووە، بۆیە شەرم دەکات و هێشتان چاوەکانی نەکراونەتەوە.

ئەویش وتی: وەك توێژەری کۆمەڵایەتی ، قوری بنیت دەرهێناوە، چوویتە ناو وردەکاریی ژیانیەوە.

منیش وتم: خۆی داوای سێکسکردنی لێ کردم و وتی کەی ویستت پەیوەندیم پێوە بکە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: تۆ چیت پێ وت؟

وتم: پێم وت (حەزم لە سێکسکردن نیە، دەمەوێ بە یەکەوە بخۆین و بخۆینەوە، کەشێکی خۆشیش بە یەکەوە بگۆڕین).

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەو چی وت؟

وتم: پێی وتم (تۆ پارەی خۆت دەدەیت، چۆنت پێ خۆشبێت وادەکەم).

نەوزاد دۆخینیش وتی: دەستە گوڵی خۆت لێدا، کەواتە سبەی شەو لەگەڵ ئەویت؟

منیش وتم: پەلەم چیە، جارێ رماوەیەکی زۆرمان لە پێشە، با بمێنێ بۆ کاتێکی کە. سبەی شەو دەچینە یانەیەکی تری شەوان، زۆر لەم یانەیە خۆشترە، بڕوا ناکەم شتی وات بینیبێت.

ئەویش وتی: یانەی شەوان بریتیە لە گۆرانی و موزیك و سەما، لەوە زیاتر هەیە؟

وتم: ئەو شوێنە بۆی دەچین زۆر جیاوازە، دەیان سەماکەری رووسی و ئۆکرانی کە ژمارەیان لە سەد ژن زیاترە، بە جلی نیمچە رووتەوە دێنە بەر دەمت و دەچنە سەر ستێج و بە دەم سەماکردنەوە هێدی هێدی جلەکانیان دادەکەنن و خۆیان رووت دەکەنەوە.

ئەویش وتی: دیارە پێشتر چوویتە ئەو شوێنە وا بە وردی وەسفی دەکەیت؟

وتم: دوو مانگ بەر لە ئێستا لەگەڵ هاورێیەکم بە فڕۆکە هاتینە ئەرمینیا و حەفتەیەك لێرە ماینەوە، دوو شەو لە سەر یەك چوومە ئەم یانەیە.

# دەریاچەی سیڤان

عیزەدین چاو حیز وتی: دوێنێ شەو لە کاتژمێر دەی شەو تا بەری بەیان لە یانەی شەوان مانەوە و کەیف و سەیفتان دەکرد، منیش بە تەنیایی لێرەدا مامەوە، کاتم لێ نەدەڕۆیشت.

نەوزاد دۆخینیش وتی: پێمان وتی، خۆت نەهاتی.

ئەویش وتی: ئەوە یەکەمین جار نییە بە یەکەوە گەشت دەکەین، شارەزای من بوویت، لە کاتژمێر هەشت و نیوی شەو بەو لاوە بەرگە ناگرم، خەوم دێت. ئەگەر نەخەوم سەرم ژان دەکات و خەوم دەزڕێت و تا بەیانی بێدار دەبم.

منیش رووم لە نەوزاد دۆخین کرد و پێم وت: عیزەدین چاو حیز راست دەکات، نابێ هەموو شەوێك بچینە یانەی شەوان و بە تەنیا بەجێی بێلین.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەگەر شوێنێکی خۆش پێ دەزانن، با بۆی بچین و ئەویش لەگەڵ خۆمان ببەین، تا چیتر گلەییمان لێ نەکات.

منیش وتم: دەریاچەی (سیڤان) لە گەشتی یەکەم جارم لەگەڵ ئەمجەد مەندیل بۆ ئێرە بۆی چووین. ئەگەر پێتان خۆش بێت، بە جۆرج دەڵێین بمانبات بۆ ئەوێ.

نەوزاد دۆخینیش وتی: بە چەند دەمانبات؟

وتم: جاری پێشوو ئێمەی بە چل درام بۆ ئەوێ برد. بەڵام لەوێشەوە ئێمەی برد بۆ شوێنێك پێی دەڵێن (دلی جان) شوێنێکی

زۆر خۆش و دڵڕفێنە، لە ژیانمدا شوێنی وا خۆشم نەبینیوە، پڕ بوو لە گـوڵی دەگـمەن و نـاوازە، بـۆن و بەرامی گوڵەکـان مەسـت و حەیرانیـان دەکـردین، گەشـتیاران لە هەمـوو شـوێنێکەوە بـۆی هـاتبوون. چـوار دەرەی بە شـاخی بەرز چنرابـوو، لە بەر چـڕی دارستانە سەوزەکانی ئاسمانمان لێ دیار نەبوو.

گەشـتیاران بە تەلەفریـك بە یەك درام لەوێـوە دەچـوونە سـەر شـاخ، کـاتێکی خۆشـیان لە نـاو دارسـتانەکە و کەنـاری کانیـاوە سازگارەکانی بەسەر دەبرد.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: لە قسـەکانت پێ دەچێت شـوێنێکی زۆر خۆش بێت، چاوەڕێی چی دەکەیت، پەیوەندی بە شوفێرەکە بکە با بێت بمانبات.

عـیزەدین چـاو حـیزیش وتی: تـا دوا نەکەوتـوین پەیوەنـدی پێـوە بکە، تا ئەو دێت ئێمەش خۆمان دەگۆڕین.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: ئەو شـاخەی کە باسی دەکەیـت، شـوێنی پشوودان و خواردن و خواردنەوەی لێیە؟

وتم: هەندێك کەپری گەشتیاری و ریستورانتی بچکۆلانەی لێیە، خواردن و خواردنەوەی خێرای تیا دەفرۆشرێت.

عـیزەدین چـاو حـیزیش وتی: مـادام بـۆی دەچـین پێویسـت ناکات بۆمان باس بکەیت، بە چاوی خۆمان بیبینین تام و چێژی خۆشتر دەبێ.

منـیش بە ئەمـجەم وت: تـۆش هەسـتە خـۆت بگـۆڕە بـا دوا نەکەوین.

ئەمـــجەد مەنـــدیلیش وتی: ئەی ئەوە نەبـــوو جـــاری پێشـــوو بە یەکەوە بۆی چوین، من جارێك بچمە شوێنێك دووبارەی ناکەمەوە ئەگەر وەکو بەهەشتیش خۆشبێت.

عـــیزەدین چـــاو حـــیزیش وتی: زۆری لێ مەکە، بـــا بە دڵی خـــۆی بکات.

ئەوەبـــوو پەیوەنـــدیم بە (جـــۆرج) کـــرد و پـــێم وت: کاتـــت هەیە بمانبەیت بۆ دەریاچەی (سیڤان) و سەوزاییەکانی (دڵی جان)؟.

داوای ئەدرێسی لێ کردم، بە کورتە نامەیەك بۆم نارد. وتی: دوای کاتژمێرێکی تر لاتان ئامادە دەبم.

نەوزاد دۆخینـــیش پـــێی وتـــم: پێـــت نەوتـــین ئەم دەریـــاچەیە وەکـــو دەریـــاچەی قەزویـــنی ئازربایجـــان گەشـــتیارانی ژن مەلەوانی لە نـــاو دەکەن؟

وتـــم: بێ گومـــان وەکـــو هەر دەریـــاو دەریـــاچەیەك گەشـــتیاران بـــۆ مەلەوانی رووی تێ دەکەن و لە کەنـــاری دەریـــاکە خۆیـــان دەدەنە بەر تیشکی خۆر و لە ناو لیم لە سەر پشت لێی رادەکشێن.

عیزەدین چـــاو حـــیزیش وتی: ئەوەم بە دڵە، هەزار یانەی شـــەوانی بە قوربـــان بێـــت، لەجیـــاتی ژنێـــك دەیـــان ژن بە رووتی دەبینـــین و چاوەکانمان شەحن دەبنەوە.

نەوزاد دۆخینـــیش وتی: ئەمـــرۆ چمـــان بـــۆ ئامـــادە دەکەیـــت بیخۆین؟

ئەویـــش وتی: هێلکەمـــان نەمـــاوە، مـــن چـــایەکە ئامـــادەکەم ئێـــوە دەچن بیهێنن؟

نەوزاد دۆخینیش وتی: من دەچمە خوارەوە و لە مارکێتەکەی لای خۆمان نیو دەستە هێلکە دەکرِم و لە نانەواخانەکەش سێ ئەستورکی گەرم دێنم.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئەمڕۆ ئیشی. چێشت لێنانم نییە. لە سەر دەریاچەی (سیڤان) نانی نیوەڕۆ دەخۆین و شەویش لە گەڕانەوە لە سەررێگا خواردنێکی سووک دەخۆین.

نەوزاد دۆخینیش بە پێکەنینەوە وتی: منیش وەك تۆ ئەمڕۆ قاپ شوشتنم نییە.

ئەمەی وت و چووە دەرەوە. دوای تۆزێك هاتەوەو هێلکەو ئەستورکی گەرمی هێنا. رووی لە عیزەدین چاو حیز کرد و پێی وت: ژنە نانەواکە لێی دەپرسیت و دەیوت (چۆنە هاورێ مشەوەشەکەت لەگەڵ نییە).

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئەو پیرەژنە حەزی لە تۆ کردووە، ویستوویەتی بەو قسانە بتدوێنێ.

ئەویش وتی: ئەگەر واش بێت، تا ژنی ناسك و جوان هەبێت، ئیشم بەو پیرەژنە نییە.ئەویش وتی: ئەی هەر تۆ نەبوویت لە ئازربایجان ژنێکی لەوە بە تەمەنترت گا؟

ئەویش وتی: ئە رۆژی زۆرم خواردبۆوە سەرخۆش بووم لە سەر شەقام چاوم پێی کەوت، وەك کچێکی ناسك و نازدار هاتە بەرچاوم، کە داوای گانم لێی کرد، زۆری پێخۆش بوو لەگەلم هات.

منیش وتم: کە لەگەڵی خەوتی پەشیمان نەبوویتەوە؟

بە پێکەنینەوە وتی: زۆر خۆش بوو، ئەویش وەکو من زۆر تامەزرۆ بوو، کە لێ بوومەوە دە مەناتم دایە، لە خۆشیان وەخت

بوو بفڕێت، بە تورکی پێی وتم (تۆ پیاوێکی باشیت ئەو چاکەیەت لەگەڵ کردم).

منیش وتم: ناکات دلت بەو قسانە خۆشبێت و بە سەدەقە تێی گەیشتبیت؟!

ئێمە لەو قسانەدا بووین، شوفێری تەکسییەکە تەلەفۆنی کرد و وتی: لە بەر دەرگای باڵاخانەکەتان چاوەڕێتان دەکەم.

ئەوەبوو جلمان لە بەر کرد و چووینە خوارەوە و لەگەڵ جۆرج بەرەو دەریاچەکە بەڕێ کەوتین. دوای کاتژمێرێك گەیشتینە جێ.

جۆرج رووی لە نەوزاد دۆخین و عیزەدین چاو حیز کرد و وەسفی دەریاچەکەی بۆ کردن و وتی: ئەم دەریاچەیە نزیکەی حەفتا کیلۆ مەتر لێرە دوورە، لە گەشتی یەکەم جارم بۆ ئێرە بۆی چووم. ئەم دەریاچەیە گەورەترین دەریاچەی ئەرمینیایە، ئاوەکەکەی سازگار و شیرینە، گەورەترین دەریاچەی جیهانیشە کە لە بەرزاییەکاندا بێت، دەکەوێتە پارێزگای غەفار کۆتیك، هەزار و نۆ سەد مەتر بەرزترە لە سەر ئاستی دەریا و ئاوی بیست و هەشت رووبار و جۆگەلەی دەرژێتە ناو.

کە گەیشتینە لێواری دەیاچەکە، تەنها پیرەژنێك و پیرە مێردێك لە رۆخی دەریاچەکە لە ناو لیم لە سەر پشت لێی راکشابوون و خۆیان خستبووە بەر تیشکی خۆر.

کە نەوزاد دۆخین ئەمەی بینی، دەموچاوی گرژ بۆوە و زەوق تێکچوو، بە توانجەوە وتی: هەر ئەوەش بوو دەیاچەی (سیڤان) سەعاتێکە پیایدا هەڵدەڵێن!

منیش وتم: جاری پێشوو کە ئێمە هاتین، وەها نەبوو، پڕ بوو لە ژن و کچی جوان، وەکو ماسی لە ناو ئاوەکە مەلەوانیان دەکرد و لە شیان هێندە سپی و تەنك بوو، وەکو زیو دەتریسکایەوە.

جـۆرجیش وتی: لە رۆژانی پشـوو و بۆنەکانـدا خەڵـکی روو لـێرە دەکەن و لە پڕییان جمەی دێ. هەروەها دوای نیوەڕۆ کەشـو هەوا گەرم تر دەبێت، ئینجا گەشتیاران بۆی دێن.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەگەر بمزانیبا وایە نەدەهاتم، تا ئێوارە بۆ خۆم لە پارکی ئازادی دادەنیشتم.

جۆرجیش بە دەست ئیشارەتی بۆ ئەو شاخە کرد کە لە تەنیشت دەریـاچەکە بـوو، وتی: ئەم شـاخە بە شـاخی پـیرۆز نـاوی دەبەن، کەنیسـەیەکی گەورە لە سـەر لـووتکەی شـاخەکەیە، مێژوویـێکی زۆر کـۆنی هەیە، گەشـتیاران لە هەمـوو شـوێنێکەوە روی تێ دەکەن و وێنەی لەگەڵ دەگرن. ئەم کەنیسـەیە بە زمانی ئەرمەنی پێی دەوترێ (سـیڤانا فانـك)، کـۆمەڵگەیەکی خانەقـایەن دەکەوێـتە نـیمچە دوورگەیەك لە کەنـاری بـاکووری رۆژئـاوای دەریـاچەی سـیڤان لە پارێزگای (جێگار کۆنیـك) لە ئەرمینیـا. ئەگەر حەزبـکەن لەگەڵتـان دێم، بەو پلیکانانە بۆی دەچین.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: من قاچەکانم تەواو نییە، ناتوانم بە سەر ئەو هەموو پلیکانانە بکەوم.

جۆرجیش وتی: بۆ ئەو کەسانەی چۆکیان تەواو نیە، ئاسان نییە.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: چ لەو کەنیســەیە بکەیـن، بە ئـێمە چی کەنیسـەیەکی مێژووییە، یان نان ئێمە بۆ ئەوە هاتووین، چاومان بە ژن و کچی جوان بکەوێت.

منیش وتم: تۆ پسپۆری پیرەژنانی، ئەوە نییە رۆخی دەریاچەکە پیرەژنێکی لێیە، برۆ خۆتی پێ بناسێنە و مەلەوانی لەگەڵ بکە.

ئەویش وتی: خۆ کفر نەبوو لە ئازربایجان پیرەژنێکم گا، ئەم رووداوە بووە حیکایەتی مێشێ و هەر نەبڕایەوە!

ڕووم لە جۆرج کرد و پێم وت: ئێمە هەر هاتووین، لەم نزیکانە شوێنێکی خۆشی لێ نییە بۆی بچین؟

ئەویش وتی: ئەرمینیا وڵاتێکی قەشەنگە، هەموو شوێنەکانی خۆشن ئەگەر ناتانەوێ مەلەوانی بکەن، دەتانبەم بۆ (دلیجان).

نەوزاد دۆخینیش وتی: دلیجان لە چیەوە هاتووە؟

جۆرجیش وتی: دلی جان بە زمانی ئێرە بە مانای دۆڵی گول و گولزار دێت.

# دلیجان

گەیشتینە شوێنێك، جۆرج وتی: ئەم شوێنە بە زمانی ئەرمەنی پێی دەڵێن (تساغ کاتسوریان) کوردانی ئێزدیش پێی دەڵێن (دلیجان) واتە دۆڵی گوڵ و گوڵزار. ئەم شوێنە کۆمەڵگەیەکی گەشتیاری ناوازەیە لە ئەرمینیا، دیمەنێکی سروشتی دڵڕفێنی هەیە، لە بەر دیمەنە جوان و سەرنج ڕاکێشەکانی و بە هۆی چڕو پڕی دارە سەوزو بەرزەکانی و ئەو شاخە بەرزانەی لە چواردەوریدان، گەشتیاران بە سویسرای ئەرمینیا ناوی دەبەن.

ئەو ناوچەیە لە سەردەمی حوکمڕانێتی یەکێتی سۆڤێتدا گەورەترین مەڵبەندی وەرزشی یارییەکانی ئۆلۆمپی بووە. لەم ساڵانەی دواییدا حکومەتی ئەرمینیا بایەخی زیاتری پێی داوە و هەندێك ریستورانت و شوێنی حەوانەوەی لێ دروست کردووە و تەلەفریکە کۆنەکەی سەردەمی سۆڤێتیشی- نۆژەن کردۆتەوە، گەشتیاران بۆ بینینی ئەو دیمەنە جوان و دڵڕفێنانە، پێی دەچنە سەر شاخ. لە وەرزی زستانانیشدا ئەم دۆڵە دەبێتە شوێنی خلیسکانێی سەر بەفر و لە هەموو ناوچەکانی جیهان گەشتیاران رووی تێ دەکەن.

لە دەوروپشتی ئەم دۆڵە چەندین هوتێل و مەڵبەندی وەرزشی تیایە، گەشتیاران لە ماوەی مانەوەیان لێرەدا سوودی لێ وەردەگرن.

جۆرج بەردەوام بوو لە وەسفکردنی ناوچەی (دلیجان) و وتی: سیحری دلیجان لەوەدایە کە ئەم دۆڵە دەیان جۆری جۆری گوڵی

جوان و بۆنخۆشی تیایە، لە جیهاندا هاوتایان نیە. بۆنی ئەو گوڵانە تێکەڵ بە هەواکە دەبن، ئاستەمە گەشتیاران لە هاوین، یان لە زستاندا بە ئاسانی دەستبەرداری بن.

منیش وتم: چ کاتێك زیاتر گونجاوە بۆ سەردانی ئەم ناوچەیە؟

جۆرج وتی: بە درێژایی ساڵ ئاووهەوای دلیجان خۆشە، هەر بۆیە گەشتیاران لە گشت وەرزەکانی ساڵدا سەردانی دەکەن. دیمەنە سروشتییە ناوازەکەی و ئاوە کانزاییەکەی کە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی پێست بەکار دێت، گشت ئەمانە وایان کردووە، کە ئەم ناوچەیە جیاوازی هەبێت لە ناوچەکانی تر، چ لە هاویندا، یان زستاندا.

پێش ئەوەی بگەینە (دلیجان) گەیشتینە تونێلێك، جۆرج ئاماژەی بۆ کرد وتی: ئەم تونێلە درێژیەکەی دوو کیلۆمەتر و نیوە و بەشێکە لە رێگا خێراکەی، هەروەها ئەم شارە وێستگەی شەمەندەفەریشی لێیە، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە دروست کراوە.

دوای ئەوەی لە تونێلەکە پەڕینەوە، لە بەر چڕی دار و درەختەکان ئاسمانمان لێ دیار نەبوو. رووم لە جۆرج کرد و پێم وت: ئەم شوێنە چی پێ دەڵێن؟

وتی: لێرەوە دارستانەکانی (دلیجان) دەست پێ دەکات، کە رووبەرەکەی لە سیوچوار هەزار هکتار زیاترە، کۆمەڵێك دیمەنی وێنەیی بێهاوتای چێژ بەخش لە خۆی دەگرێت. ئەم دارستانە لە سەرەتادا شوێنێکی پارێزراو بووە، لە ساڵی ١٩٥٨ دامەزراوە، دواتر لە ساڵی ٢٠٠٢ زیاتر بایەخی پێ دراوە و بە پارکی نەتەوەیی دلیجان

ناوزەد کراوە. نزیکەی چل جۆر دار و هەژدە جۆر نەمام و نۆ سەد جۆر رووەك لە خۆی دەگرێت.

نەوزاد دۆخینیش وتی: مادام پێشتر ئەم شوێنە پارێزراو بووە، لەوانەیە ئاژەڵی کێوی تیابێت.

جۆرجیش وتی: ئەم شوێنە دەولەمەندە بە ئاژەڵی کێوی، لەوانە ورچی قاوەیی و گورگ و پشیلەی سیڤانی و کۆتر و مامزی سوور و هەڵۆی زێڕین و پەپوولە و چەندانی تر، کە ئەم پارکە نایابەیان کردۆتە ماڵی خۆیان.

دوای بڕینی ماوەی پەنجاو دوو کیلۆ مەتر ئینجا گەیشتینە ناوچەی (دلیجان). جۆرج ئۆتۆمبێلەکەی لە تەنیشت ئۆفیسێك راگرت وتی: دابەزن، لێرەوە بە تەلەفریك دەچینە سەر ئەو شاخانە و لە ئاسمانەوە دیمەنی ئەو دار و درەخت و گوڵ و گوڵزار و ئاژەڵە کێویانە دەبینین، دیمەنێکی زۆر دڵڕفێنەن هەرگیز لێی تێر نابن.لە سەر ئەو شاخە، دارستانێکی گەورە و هەندێك شوێنی گەشتیاری و ریستورانت و شوێنی ئەسپ سواری لێیە. چەندی ئارەزوو بکەن لەوێ بمێننەوە. دوایی هەر بەو تەلەفریکە بگەڕێنەوە، ئینجا دەچینە دەریاچەی (بارز).

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەم تەلەفریکە زۆر کۆن دیارە.

جۆرجیش وتی: وەکو پێشتر وتم هی سەردەمی سۆڤێتە، دوای جاڕدانی سەربەخۆیی ئەرمینیا، نۆژەن کراوەتەوە. بە نێوان دۆڵ و شاخەکانی ئێرە تێدەپەڕێت، بە یەکێك لە تەلەفریکە هەرە درێژەکانی جیهان هەژمار دەکرێت.

تکیتمان بڕی و سواری تەلەفریکەکە بووین، ئاسمانێکی سپی و بێ گەرد وەکو چەتر لە سەرمانەوە بوو، لە ژێرەوەش دیمەنی گوڵ و

گـوڵزار و دار و درەخـت و ئـاژەڵە کێویەکـان جـوانییەکی بێوێنەیـان هەبوو.

سـیحری نـاوچەی (دلیجـان) خـۆی لە گـوڵ و گـوڵزارە هەمەڕەنگەکاندا دەبینییەوە، کە لەگەڵ گژوگیای سەوز باوەشیان بەیەکتری کردبوو.

نـزیکەی دوو کـاتژمێر لە سـەر شـاخەکە مـاینەوە و لە نـاو دارستانەکە پیاسەمان کـرد و لە کانیاوەکانی نـاو دارسـتانەکە ئـاوی سـازگارمان خـواردەوە و دوایی بە تەلەفـریکەکە گەڕایـنەوە شـوێنی خۆمان و بەرەو دەریاچەی (بارز) بەڕێکەوتین.

دەریـاچەکە لە بـاکووری نـاوچەی دلیجـان بـوو، دەریـاچەیەکی خنجـیلانە بـوو، لە شـوێنێکی بەرز لە ئـامێزی شـاخ و دارسـتانێکی چڕدابوو ئاوی دەریاچەکە ڕەنگی دارستانەکەی وەرگرتبوو وەکو ئەو سـەوز دەچـۆوە. گەشـتیارێکی زۆر ڕوویـان تـێ کردبـوو، هەنـدێکیان لەوە دەچوو خەڵکی ئەرمینیا بن و بۆ سەیران ڕوویان لەوێ کردبێت، چونکە خەریکی گۆشت برژان و ڕاوکردنی ماسی بوون لە دەریاچەکە، هەنـدێکی تـریش لە سـەر کورسـیەکانی ڕۆخی دەریـاچەکە لە ژێـر سـێبەری دار چنـارە بەرزەکـان دانیشـتبوون، چێژیـان لەو دیـمەنە دڵڕفێنانە وەردەگرت. هەندێك بەلەمی چوپیش لە ناو ئاوەکە بوون، بە درامێك گەشتیاران لە ناو ئاوەکە گەشتیان پێ دەکرد.

جـۆرج لە ڕۆخی دەریـاچەکە لە سـەر کورسـیێك دانیشـت و ئێمەش سـواری بەلەمێـك بـووین و گەشـتێکی کـورتی ئاویمـان کـرد. نـزیکەی نیو کاتژمێر بەناو ئاوەکە خـولاینەوە، دوایی گەڕاینەوە لای جۆرج و بەڕێکەوتین.

لە نزیـك دەریـاچەکە ریسـتورانتێکی گەورەی لێ بـوو جـۆرج ئۆتۆمبێلەکەی راگرت و وتی: فەرمـوون دابەزن لەم ریستورانتە نـانی نیوەرۆ دەخۆین و دوایی دەگەڕێینەوە ئێریڤان.

کە گەیشـتینەوە ئێریڤـان، جـۆرج ئـێمەی لە بەردەم دەرگـای باڵاخانەکە دانا و وتی: بەیانی ناتوانم لەگەڵتان بم، هەندێك ئەرکم لە سەرە دەبێ جێبەجێیان کەم. بەڵام رۆژی دواتر کاتژمێر دەی شەو ئەگەر حەز بکەن دەتانبەم بۆ یانەیەکی شەوان و کاتێکی خۆشی لێ بە سەر ببەن.

منیش وتم: لە وڵاتی میسر و ئوردن یانەی شەوانی زۆرم بینیوە، دەبێ یانەی شـەوانی ئێرە چ جیاوازییێکیان لەگەڵ یانە شـەوانەکانی ئەوێ هەبێت؟

وتی: لێرەش شوێنی وەهای لێیە، بەڵام دەتانبەم بۆ شوێنێك لە هیچ وڵاتێکی عەرەبیدا نییەو ئەوەیان لە یانەی شاوانی ئەو وڵاتانە موحتەرەم ترە.

کە وای وت، لە دڵی خۆمدا وتم (دیارە ئەو شوێنە سەماکردن و ژنی رووتی تیا نییە).

عیزەدین چاو حیزیش وتی: من لە دوای نوێژی عیشا دەخەوم، بۆیە لەگەڵتان نایەم، لێرە دەمێنمەوە.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: حەزم لە چوونە یانەی شـەوان نییە، بۆیە منیش لەگەڵ تۆ دەمێنمەوە.

منیش وتم: بە قسەی جۆرج بێت ئەو شوێنە موحتەرەمە.

کە وام وت، ئەمجەد مەندیل لە بڕیاری خۆی پەشیمان بۆوە و وتی: مادام شوێنێکی موحتەرەم بێت، منیش لەگەڵتان دێم.

نەوزاد دۆخینیش بە جۆرجی وت: وا ئەم شەو دەچینە ئەو شوێنە موحتەرەمە، ئەی بەیانی دەمانبەیت بۆ کوێ؟

ئەویش وتی: بەیانی پێویستتان بە من نابێت، سەنتەری شار دوو شوێنی خۆشی لێیە، هەزار مەتر لێرە دوورە، یەکێکیان پارکی ئازادیە و لە بەیانیانەوە تا درەنگی شەو لە خەڵك جمەی دێ. دارو درەخت و گوڵی جوان و نافورەی ئاوی لێیە. لە ژێر دارەکان و بەرامبەر نافورەکان کورسی دانیشتنی لێیە، ئەگەر جارێك بۆی بچن، دوو بارە بۆی دەچنەوە. شوێنێکی تریش هەیە، هەندێك لە سەرەوە ترە، بە زمانی ئەرمەنی پێی دەڵێن (هانرا پتوتیان هورا بیراك) واتە مەیدانی کۆماری. ئەو شوێنە لە ئێوارەوە خەڵك رووی تێ دەکات. بەڵام زیاتر لە شەواندا قەرەباڵغ دەبێت و ژنە لەشفرۆشەکانیش لەو مەیدانە لە نێچیری خۆیان دەگەڕێن و لەگەڵیان رێکدەکەون.

کە وای وت، نەوزاد دۆخین رووی لە عیزەدین چاو حیز کرد و بە پێکەنینەوە پێی وت: ئەم شوێنە بە دڵی هەردووکمانە، هەریەك و ژنێکی جوان لەو ژنە لەشفرۆشانە بۆ خۆمان دەدۆزینەوە و لەگەڵ خۆمان دەیانهێنینەوە.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: وابزانم ئێوە قەت لە ژن تێر نابن. ئێرە دەیان شوێنی سروشتی خۆشی لێیە، لەجیاتی ئەوەی چێژ لەو سروشتە جوانە و دیمەنە ناوازانە وەربگرنن تەنها بە دوای ژنەوەن، لە ژن زیاتر چاوتان هیچی تر نابینێ.

نەوزاد دۆخینیش رووی لە من کرد و وتی: تۆش قسەیەك بکە، بۆچی بێ دەنگیت، دیارە تۆش وەکو ئەمجەد مەندیل تەنها بۆ دیتنی سروشت هاتوویت؟

وتم: بڕوا ناکەم هیچ وڵاتێك سروشتەکەی بە قەدەر سروشتی کوردستان خۆشتر بێت، بۆچی درۆتان لەگەڵ بکەم، من هاتووم کەشێك بگۆڕم و چێژ وەربگرم، بەڵام مەرج نییە وەکو ئێوە سێکس لەگەڵ ژنان بکەم.

ئەویش وتی: مەبەستت چیە؟

وتم: ئەگەر هاوڕێیەکی ژنم دەستکەوت، لەگەڵی دادەنیشم و بە دەم خـواردن و خواردنەوەشـەوە قسـە دەکەیـن. دەمەوێ نهێـنی ژیانیان بزانم، بۆچی ئەوانە کاری لەشفرۆشی دەکەن.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: خۆ نەبوویتە توێژەری کۆمەڵایەتی، تا لە ژیانی خەلکی بکۆڵیتەوە.

وتم: هەر کەسێك لە ژیانیدا ئامانجێکی هەیە، هەر یەك لە ئێوە کە هاتوون بۆ ئێرە، ئامانجێکتان هەیە، منیش وەك چیرۆکنووس و ڕۆماننوسێك ئامانجم ئەوەیە ئەوەی دەیبینم بیکەمە کەرەستەی ڕۆمانەکانم.

کە وام وت، ئەمـجەد مەنـدیل وتی: تـۆ چ کارێکـت بە ژیـانی خەلـکە، چی دەکەن و نـاکەن، ڕازی نـیم نـاوم بخەیـتە نـاو ڕۆمانەکەت.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: لە لایەن مـنەوە ئازادیـت، شـانازی بەوە دەکەم ببمە پاڵەوانی ڕۆمانەکانت.

عـیزەدین چـاو حـیزیش وتی: ڕووداوەکـان چـۆن دەگێڕیـتەوە بیگێڕەوە، تەنها ناوم مەهێنە.

منیش وتم: خەمتان نەبێت، ناوی کەستان وەك خۆی ناهێنم، تەنها ڕووداوەکان دەگێڕمەوە و تێکەڵ بە خەیاڵی ئەدەبی خۆمیان دەکەم.

جۆرج ئێمەی لە بەردەم دەرگای باڵاخانەکە دانا وتی: لە بیرم چوو پێتان بڵێم ئەگەر ژنتان ویست پەیوەندیم پێوە بکەن. ژمارەی لەشفرۆشێکی زۆرم لایە، دوو کاتژمێر لەگەڵتان دەمێننەوە تەنها بە سی درام، ئەگەر تاکو بەیانیش لەگەڵتان بمێننەوە، دەبێ سەد دۆلاری ئەمریکییان بدەنێ.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەمڕۆ زۆر ماندووین، تاقەتی هیچمان نییە، کەی ویستمان پەیوەندیت پێوە دەکەین.

عیزەدین چاو حیزیش ڕووی لە ئێمە کرد و وتی: خواردنی چێشتخانە ناخورێت، زۆریش گرانە، با لە مارکێتەکە هەندێك برنج و پێداویستی بکڕین، لەگەڵ ئەو ئازووقەیەی کە لەگەڵ خۆمان هێناومانە بەکاریان دەهێنین.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: لە هەولێر هەندێك گوێزو کولیچەم هێناوە، تەنها نان دەکرم، حیسابی من مەکەن.

منیش وتم: کێ خواردنمان بۆ ئامادە دەکات، بە تەمای من مەبن، تەنها دەزانم چای ئامادە بکەم.

نەوزاد دۆخینیش وتی: منیش قاپەکان دەشۆم.

عیزەدین چاو حیز وتی: کە پۆلیس بووم گوێزرامەوە بۆ باشووری عێراق، ماوەیەکی زۆر لەوێ مامەوە، لەوێ فێری چێشتلێنان بووم. خواردنێك دروست دەکەم پەنجەی خۆتانی لەگەڵ بخۆن. لە شاری هەولێرهاورێیەکی چێشتلێنەرم هەبوو، ماوەیەك نەخۆش

کەوت، لە چێشتخانەی منی لە شوێنی خۆی دانا، میوانەکان هەر وایان دەزانی ئەو خواردن ئامادە دەکات، کەس هەستی پێ نەکرد.

لە نزیك ئەو باڵاخانەیەی کە لێی دابەزیبووین، دوو مارکێتی گەورەی لێ بوو، چووینە یەکێك لە مارکێتەکان، پێداویستییەکانمان کری. نەوزاد دۆخین کە چاوی بە خواردنەوە کهولییەکان کەوت، وتی: برایان چی دەڵێن بۆ خواردنەوەی ئەمشەو کارتۆنێك بیرە لەگەڵ خۆمان ببەین؟

عیزەدین چاو حیزیش وتی: لە گەشتی پێشووم بیرەم لەم مارکێتە کڕیوە، بیرە خۆمالیەکە دەکڕین ئەو لە بیرە بیانیەکان خۆشتر و هەرزانترە.

بیرە خۆمالیەکە یەك لیتر بوو، لە ناو بتڵێکی پلاستیکیدا بوو، کارتۆنێکمان بە پێنج درام کڕی، شەش بتڵی تێدا بوو، دەیکردە دوانزە دۆلاری ئەمریکی.

# شەوێکی سوور

نەوزاد دۆخـــین لە چێشــتخانەکە دەهـــات و دەچـــوو، لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد. منیش وتم: ئەوە چیتە، لە چی دەگەڕێیت؟

وتی: لە برسان وەختە دڵم ببورێتەوە، شتێك نییە بیخۆین؟

عیزەدین چاو حیزیش وتی: وەرە دانیشـە، ئێستا شێف عیزەدین چاو حیزی براتان خواردنتان بۆ ئامادە دەکات.

منـیش وتـم: ئەگەر خـواردن بخـۆین، بیرەمـان پـێ نـاخورێتەوە. عیزەدین چاو حیزیش وتی: خواردنێکی سووك ئامادە دەکەم، لەگەڵ زەڵاتە و چەرەزات و زەیتـوون لە سـەر خـوانەکە دایـدەنێم و لەگەڵ خواردنەوە دەیخۆین.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: خۆزگە دەمزانی ئەو بیرەیە چ تامێکی لێ دێت وا مەراقتانە.

عـــیزەدین چـــاو حـــیزیش وتی: خـــۆزگەی بـــۆچیە، تـــۆش وەرە لەگەڵمان بەشدار بە و بیخۆوە ئەوکات دەزانی تامی چی لێ دێت.

ئەمــجەد مەنــدیلیش وتی: لە وەتی هەم دەمــم لــێی نەداوە، ناشمەوێ بیخۆمەوە.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: ئەگەر پێـت وابێـت حەرامە، ئوبالـت بە ملم، بیخۆوە گوناهبار نابیت.

منیش وتم: گەورە زانای ئایینی حەسەن تورابی لە سوودان چەند سـالێك لەمەو بەر فەتـوای دا وتی: بـیرە ئەگەر رێـژەی کهـولی زۆر نەبێت حەرام نییە.

وتی: بـا بۆخـۆی هەروا بڵێـت، بە قسـەی ئەو نیـیە، خـوا لە موسلمانانی قەدەغە کردووە.

منیش وتم: ئەگەر وابێت، دانیشتنیش لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەخۆنەوە هیچ جیاوازیێکی نییە و حەرامە.

ئەویـش وتی: دەتـانەوێ بەو قسـانە بەشـداریتان لەگەڵ بـکەم، هیچ خۆتـان مانـدوو مەکەن، پێش ئێوە زۆر کەس هەولیان لەگەڵ داوم، بە قسەم نەکردوون. مەسەلە حەرام و حەڵاڵ نیە، باوەڕم پێی نییە بۆیە نایخۆمەوە.

عـیزەدین چـاو حـیزیش وتی: ئەرێ بە راسـتی تـۆ لە خـواردنیش بەشداریت لەگەڵ نەکردین، ئەی چی دەخۆیت؟

مەندیلیش وتی: هەندێك کولیچەو گوێزم لە هەولێر لەگەڵ خۆم هێناوە، تەنها ئەوە دەخۆم.

منـیش وتـم: ئەگەر خواردنمـان لەگەڵ نەخۆیـت، لە قورگمـان نـاچێتە خـوارەوەن هەر هـیچ نەبێـت لە خـواردنی زەڵاتە و زەیتـوون بەشداریمان لەگەڵ بکە.

وتی: ئێوە حورپەتی خۆتان وەرگرن، شەرم ناکەم.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: لە بیرمـان چـوو تەلەفـۆن بـۆ فەرهـاد بکەین، دەبێ نەهاتبێتە ئەرمینیا؟

منـیش وتـم: چەنـد رۆژێـك پـێش ئێسـتا لە بـاغی شـار بینـیم، هەندێك بازن و ملوانکەی لەنگەی ئەوروپی بە دەستەوە بوو، لێم پرسی (ئەوانە چین) وتی (لەو رۆژانە ڤیزەکەم دەردەچێت و دەچمە ئەرمینیا، ئەوانە لەگەڵ خـۆم دەبەم و دەیانکەمە دیاری بـۆ هـاورێ ژنەکانم).

نەوزاد دۆخینـیش بە پێکەنیـنەوە وتی: ئـای لەو سـەگە، بەلاش ناوی لە خۆی نەناوە شێخ!

ئەمەی وت و مۆبـایلەکەی لە گیرفـانی دەرهێنـا و مۆبـایلەکەی کردە دەرەکی و قسەی لەگەڵ کرد. فەرهاد وتی: چوار شەوە لێرەم.

نەوزاد دۆخینیش وتی: بە تەنیای؟

وتی: نەخێر برادەرێکم لەگەڵە. ئەی ئێوە؟

نەوزاد دۆخینیش سڵاوی ئێمەی پێگەیاند و وتی ئێمەش لێرەین.

فەرهـادیش وتی: ئەگەر ژنتـان ویسـت پـێم بڵـێن، ژنەکـانی ئـێرە هەموویان دەناسم، مریدی منن و پێم دەڵێن یاشێخ، لە بچووك تا گەورە، لە رووسی و جۆرجی و ئۆکرانی تا دەگاتە ئەرمەنی، هەموویان هەن بە کامل مواسەفاتەوە.

عـیزەدین چـاو حـیزیش وتی: ئەو هەمـوو هـاورێ ژنـانەت هەیە، بۆیە زوو زوو دێیتە ئەرمینیا.

نەوزاد دۆخینیش بە ئێمەی وت: چی دەڵێن دوو لەو ژنانەمان بۆ بنێرێت؟

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئێمە چوار کەسین دوو ژن بەشی چی دەکات.

ئەویش وتی: بە نۆرە دەچینە لایان و دەیانگۆڕینەوە.

منیش وتم: حیسابی من مەکەن، تەنها لەگەڵتان دەخۆمەوە.

ئەمــجەد مەنــدیلیش وتی: منــیش هەر هــیچ، تەنهــا لەگەڵتــان دادەنیشم.

نەوزاد دۆخینــیش وتی: شــتی وا چــۆن دەبێــت، ئەوەش مەکە مەســەلەی خــواردنەوەکە، بە فــێلی نەخــۆشی شــەکرە خــۆت لــێ کێشایەوە.

منیش رووم لە ئەمجەد مەندیل کرد و پێم وت: نەوزاد دۆخین راست دەکات، با دوانیش بۆ ئێمە بێتن تەنها لەگەڵیان دادەنیشین و دەخۆینەوە.

ئەمجەد مەندیل ئەوەی پێ خۆش بوو، بە نەوزاد دۆخینی وت: بە مەرجێــك ژنــم دەوێ، کەس هەقی بە ســەر مــنەوە نەبێــت، چی دەکەم و ناکەم.

منیش وتم: منیش یەکێکم دەوێت وەکو هاوڕێ لەگەڵم بێت، نامەوێ ئێوە دەستی لێ بدەن.

عیزەدین چاو حیزیش رووی لە نەوزاد دۆخین کرد و وتی: من و تۆ بۆ گانمانە، بە دوان یەك ژنیش بێت ئاساییە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: بیرۆکەیەکی باشە، با ئەوان هەر یەك و ژنێکیان بۆ بێت، من و تۆش بە هەردووکمان ژنێکمان بۆ بێت.

ئەوەبوو پەیوەندی بە فەرهاد کرد و پێی وت: سێ ژنی جوانمان بۆ بنێرە.

فەرهادیش وتی: بە کورتە نامەیەك ناونیشانی شوێنی دانیشتنی خۆتانم بۆ بنێرە، تا بۆ ژنەکان بنێرم.

نەوزاد دۆخینیش پێی وتم: ناونیشانی ئێرە لای تۆ بوو، بۆم بخوێنەوە تا بۆی بنێرم.

منیش مۆبایلەکەم کردەوەو پێم وت: بنووسە (گلندل هێلز) باڵاخانەی ژمارە حەڤدە، نهۆمی شەشەم، شوقەی ژمارە بیست و پێنج.

ئەویش ناونیشانەکەی بە کورتە نامەیەك بۆ نارد.

عیزەدین چاو حیز بە نەوزاد دۆخینی وت: زۆری نەماوە خواردنەکە ئامادە بێت، خوانەکە ئامادە بکە، هەندێك بیرە لە ناو سارد کەرەوەکە دەربێنە، تا ئەوان دێن با سەری خۆمان هەندێك گەرم کەین.

منیش وتم: تا ژنەکان نەیەن دەست بە خواردن و خواردنەوە ناکەین با ئەوانیش لەگەڵمان بەشداری بکەن.

نەوزاد دۆخینیش وتی: تۆ راست دەکەیت، ئێوە نایان گێن، تەنها لەگەڵیان دادەنیشن.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: کە ئەو ژنانە هاتن با بزانین خۆتان بۆ دەگیرێت، یان نا، وا خۆتان لێمان کردۆتە فریشتە.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: ئێوە گانتان پێ خۆشە عافیەتتان بێت، خوا دەیکرد تا بەیانی ئەوانتان دەگا، ئێمە حەزمان لە دانیشتن و قسەی خۆشە.

بەم شێوەیە، خوانەکەمان دانا و چاوەڕێی گەیشتنی ژنە لەشفرۆشەکان بووین. هەندەی پێ نەچوو زەنگی ژوورەکەمان لێی دا. نەوزاد دۆخین وتی: عیزەدین چاو حیز تۆ لە دەرگا نزیکی، ئەو تەلەفۆنە هەلگرە، بزانە کێیە.

عیزەدین چاو حیزیش تەلەفۆنەکەی هەلگرت و قسەی لەگەل کرد. ژنێك بوو وتی: شێخ فەرهاد ئێمەی ناردووە، دەرگاکەمان لێ بکەنەوە.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: لە ئێستاوە پێتان بلێم ئەوەی یەکەم جار دێتە ژوورەوە بۆ منە و حەزناکەم کەستان لێی نزیك بکەونەوە.

منیش وتم: ئەوەی دووەمیشیان بۆ من بێت.

نەوزاد دۆخینیش وتی: با قسەی ئێوە بێت ئەوەی سێیەمیش بۆ من و عیزەدین چاو حیز بێت.

عیزەدین چاو حیزیش دوگمەی دەرگاکەی داگرت و وتی: کێ دەزانێ کامەیان لە وانی تر جوانترە، تازە پەشیمان بوونەوەش نیە، بە نیسبەت من و نەوزاد دۆخین هیچ جیاوازیێکی نیە، جوان بێت، یان ناشیرین، بۆ ئێمە هەر تێپەستانە.

ئێمە لەو قسانەدا بووین، لە دەرگا درا، ئەمجەد مەندیل بە خێرایی خۆی گەیاندە دەرگاکە و کردیەوە. دوو ژنی سوور و سپی،

پرچیان زەرد بوون وەکو زێڕ دەتریسکایەوە، یەکێکیان چاوەکانی شینێکی تێر بوو، ئەوەی تریش چاوەکانی سەوزێکی گیایی بوو.

دوای سڵاوکردن، ژنە چاو شینەکە وتی: دوای کەمێکی تر هاوڕێیەکەی تریشمان دێت.

خۆی بە ئێمە ناساند وتی: من ناوم لوسینە.

ئەمەی وت و دەستی خستە سەر شانی ژنەکەی تر و وتی: ئەمەش ناوی ماریتە.

دوای ئەوە هەردووکیان لە سەر قەنەفەکە دانیشتن. منیش چوومە چێشتخانەکە و لە سەر سنیێك هەندێك خیار و تەماتەم لەگەڵ چەقۆیەك هێناو دامە دەست خاتوو ماریت و پێم وت: ئەم سینیەم لێ وەربگرەو زەڵاتە دروست بکە.

ئەویش لێی وەرگرتم و لە سەر مێزەکەی دانا و دەستی کرد بە دروستکردنی. تا لە وردکردنی خیار و تەماتەکان بۆوە، ژنەکەی تریش هات، خۆی پێناساندین وتی: ناوم سیڤانایە.عیزەدین چاو حیزیش خواردنەکەی ئامادەکرد و لە ناو مەنجەڵێکی شوشە هێنایە سەر خوانەکەو وتی: پەتاتە و سینگی مریشکیشم سوور کردۆتەوە، لەگەڵ خواردنەوەکە دەیخۆین.

منیش وتم: نەوزاد دۆخینیش هەندێك گڵاس و چەنگاڵ و کاسەی شوشەی لە بەر دەممان دانا، وتی: هەر یەکێ گلاسێك راکێشێتە بەر دەمی و بیرەی تێ کات، زەڵاتەش بکەنە ناو ئەم کاسانە و با دەست بە خواردنەوە بکەین.

ئەمەی وت و رووی لە عیزەدین چاو حیز کرد و پێی وت: یەك دوو پێك دەخۆینەوە، ئەوجا تۆ لەگەڵ سیڤانا برۆ ژووری خەوتن و کاری خۆتی لەگەڵ تەواوکە، منیش دوای تۆ دەیبەم.

ئەویش وتی: هەندە نابێ حەبی چالاکی سێکسیم خواردووە، تا حەبەکە کاریگەری خۆی دەکات، تۆ لەگەڵی برۆ، من دوای تۆ دەچم.

منیش وتم: ئەو حەبە ناوی چیە کە پێش سێکسکردن دەیخۆیت؟

وتی: ناوی (ڤاردینامیل)ە.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: تۆو نەوزاد دۆخین بۆ گان ئەوەندە پەلەتانە، وامزانی بەبێ حەب کێرتان هەڵدەستێ.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: چاك نیە کێری من بە حەب هەڵدەستێ، ئەوەی تۆ خەوی لێ کەوتووە و بە دۆڵ و زورناش هەڵناستێ.

ئەمجەد مەندیلیش بە تورەییەوە وتی: تۆ چوزانیت کێری من مردووە، دیارە ئەو کەسەی ئەو ژنانە نەگێ، کێری مردووە؟

ئەویش وتی: ئەگەر کێرت نەمردبێ پیاو هەیە خۆی بەرامبەر ئەو ژنانە رابگرێت، هێندە سپی و تەنکن، دەڵێی هەتاویان بەر نەکەوتووە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ناوی خوا بێنن، هەر کەس ئازادە چۆنی پێ خۆشە با وابکات.

ئەمەی وت و گـلاسی بـیرەکەی بەرز کـردەوە و وتی: بە خـۆشی هەمووتان.

ژنەکانیش گڵاسەکانیان بەرز کردەوە و وتیان بە خۆشیتان.

ئەمـجەد مەنـدیلیش کورسـییەکەی خـۆی لە خـاتوو (لوسـین) نزیك کردەوە و تیری چاوەکانی خۆی هاوێشتە ناو گلێنەی چاوەکانی و دەسـتی راسـتەشی خسـتە سـەر شـانەکانی و بە دەسـتی چەپەشی پرچە ئاوریشمییەکانی بۆ دەهۆنیەوە.

خـاتوو لوسینیش گڵاسێکی بەتالی راکێشا پێش خۆی و هەندێك بیرەی تێ کرد و بۆ ئەمجەد مەندیلی راگرت وتی: تۆش بەشداریمان لەگەل بکە.

ئەویش وتی: من خواردنەوەی کهولی ناخۆم.

خاتوو لوسین دوای هەر فرێك، بە چەنگال دانەیەك زەیتوونی لە ناو کاسەکە هەلدەگرت و دەیخستە ناو دەمی ئەمجەد مەندیل.

مـن و خـاتوو مـاریتیش شـانمان بە شـانی یەکـتری دابـوو، هەر جارێـك پێکمـان دەخـواردەوە، گڵاسـەکانمان لێـك دەدا ئەوجـا دەمانۆشی. بە دەم خواردنەوەش قسەمان بۆ یەك دەکرد.

نەوزاد دۆخینـیش کە پـێکی خـۆی تەواو کـرد، دەسـتی سـیڤانای گرت و بردیە ژووری خەوتن.

ئەمـجەد مەنـدیل زۆر پەلەی بـوو، خـاتوو لوسـین لەگەل خـۆی ببـاتە ژووری خەوتـن، بـۆیە نـاوە نـاوە نوقـورچەیەکی لە سـکی خـاتوو لوسـین دەدا، وەك ئامـاژەیەك کە واز لە خـواردنەوە بێنێـت و لەگەلی بچێتە ژووری خەوتن.

لوسین لەو ڕەفتارەی ئەمجەد مەندیل زۆر تورە بوو، رووی لە خاتوو ماریت کرد و بە زمانی ئەرمەنی قسەیان لەگەڵ یەکدی کرد. لە قسەکانی پێ دەچوو هۆکاری تورەبوونی خۆی بۆ باس بکات. خاتوو ماریتیش ورتەیەکی لێوە هات و بە پێکەنینەوە شتێکی چرپاندە ژێر گوێچکەکانی. خاتوو لوسینیش لە ناکاو خۆی سوڕاندەوە و دەستی بۆ ناوگەلی ئەمجەد مەندیل برد، ویستی کێری بگرێت. کە زانی کێری هەلنەستاوە، بە تورەییەوە پێی وت: مادام کێرت هەلنەستاوە، ئەم پەلە پەلەییەت لە چیە؟

ئەمجەد مەندیل بە تورەییەوە هەستا مێزەکەی بەجێ هێشت و چووە ژووری خۆی.

منیش بە خاتوو لوسینم وت: ئەمجەد مەندیل نەخۆشی شەکری هەیە گانی پێ ناکرێ، تەنها دەیەوێ دەستبازی بکات، برۆ ئاشتی بکەوە دەنا پارەت ناداتێ.

کە ئەوەم وت، گلاسی بیرەکەی دانا و وتی:لە بەر خاتری ئێوە نەبێت، دوو هەندەی هەقی خۆم پارەم بداتێ، یەك چرکە لەگەلی نابم.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: دەستخۆش هەر ئەوەت لێ چاوەڕێ دەکەین.

ئیتر ئەوەبوو رۆیشتە لای و باوەشی پێدا کرد، ئەم لاو ئەو لای رووەمەتەکانی ماچ کرد و ئاشتی کردەوە.

دوای هەندێك، ئەمجەد مەندیل و سیڤانا لە ژوورەوە بۆلە بۆلیان بوو. منیش بە عیزەدین چاو حیزم وت: برۆ تەماشایان بکە، بزانە ئەم هات و هاوارەیان لە چیە، پێیان بلێ هەندێك لە سەر خۆ بن، دەنگیان نەچێتە دەرەوە، ئابرومان دەچێت.

ئەویش رۆیشت و لە لە پشت دەرگاکە هەندێك هەستی خۆی راگرت، دوایی گەڕایەوە لامان، وتی: تێنەگەیشتم لە سەر چی ناکۆکن و بۆ وا دەکەن.

کە وای وت، روخسەتم لە خاتوو ماریت وەرگرت و چوومە لای دەرگای ژوورەکەیان. دەرگای ژوورەکە نیوە جام بوو، جامەکەی موشەجەر بوو، چاوم خستە سەر جامەکە و هەستی خۆم راگرت. لە کاتەدا دەرگاکە کرایەوە و ئەمجەد مەندیل و لوسین هاتنە دەرەوە، بەرەو سۆلۆنەکە رایان کرد، ئەمجەد مەندیل فانیلەیەکی بێ قۆل و دەرپێیەکی کورتی لەبەردابوو، سکی لوسینی دەگوشی و قدیلانەی دەکردەوە، ئەویش لە قاقای پێکەنینی دەداو بە دەنگی بەرز پێی دەوت (You are crezy)، واتە تۆ شێتی. ئەویش وەکو توتی قسەکەی ئەوی دووبارە دەکردەوە و دەیوت ناوەڵا تۆ شێتی.

بەم شێوەیە تا ماندوو بوون بەدوای یەکدی کەوتن و هەردووکیان بە یەکتریان دەوت تۆ شێتی.

منیش گەڕامەوە لای خاتوو ماریت و دەستم کرد بە خواردنەوە و گاڵتەو گەپ لەگەڵی.

خاتوو لوسین تەنها بەدیێکی کورت و سوخمەیەکی لەگەڵ سترێژێکی تەنکی لەبەردا بوو. سمتی خڕو پڕ بوو، دەتوت گندۆرەی تێر ئاوە، جووتە مەمکە کانیشی۔ وەکو میزەڵدان بە پڕی لە سەر سینەی راوەستابوون، لاشەیەکی سپی و تەنکی هەبوو، قەد و باڵای وەکو بەژن و باڵای سیڤانا و ماریت درێژ نەبوو، هەندێك لەوان کورتتر بوو. بەڵام ئەم بەژن کورتیەی زیاتر جوانی پێ بەخشی۔ بوو. دوای ئەوەی لە ئەمجەد مەندیل بێ هیوابوو، زانی کە هیچی لەگەڵ ناکات، خاولیێکی دەستدایەو چووە گەرماوەکە. ئەمجەد مەندیلیش

ویستی لەگەڵی بچێتە ژوورەوە، بەڵام لوسین دەرگاکەی داخست و نەیهێشت لەگەڵی بچێتە گەرماوەکە.

منیش بە ئەمجەد مەندیلم وت: دەمێکە وەکو پشیلە بە دوای کەوتویـــــت، لە ژوورەوە هیچـــــت لەگەڵی نەکـــــرد، دەتەوێ لە گەرماوەکە لەگەڵی بقەومێنی؟

ئەویش وتی: من ئەوها زەوقم پێ دێت، ئەوە نیە تۆش تەنها حەز دەکەیت لەگەڵیان بخۆیتەوە.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئەمجەد مەندیل راست دەکات، تۆش ئەو ژنە جوانەت لە تەنیشت خۆت داناوە و لەجیاتی ئەوەی بیبەیتە ژووری خەوتن و خۆتی پێ بەتاڵ کەیت، کەوتوویتە سەر خواردن و خواردنەوە، دەڵێی قەت نەتخواردۆتەوە.

منیش وتم: من و ماریت وەك و هاورێ بەیەکەوە دانیشتووین، قسە لەگەڵ یەك دەکەین و دەشخۆینەوە، بەڵام ئەمجەد مەندیل و لوسین وەك مشك و پشیلە بە دوای یەکتر کەوتبوون، بە یەکتریان دەوت (You are crezy).

کە وام وت، عیزەدین چاو حیز رووی لە ئەمجەد مەندیل کرد و پێی وت: لوسین چەندی لێ وەرگرتیت؟

وتی: داوای بیست درامی کرد، منیش پێم دا.

ئەویش وتی: هێشتان لەگەڵی دانیشتبایت باشتر بوو، نەوەك وەکو مشك و پشیلە لە دوای یەك رابکەن و بە یەکتری بڵێن ( You are crezy).

ئەمجەد مەندیل لە قسەکانی عیزەدین چاو حیز تورەبوو، رووی لە من کرد و وتی: هەمووی خەتای تۆیە، لە بەر تۆ نەبا لەگەڵ ئەو

نەدەهاتم. لە باغی شار پێیان وتم ئەو عیزەدین چاو حیزە زۆر بە قسەیە، لەگەڵی گەشت مەکە، ئەوەی کردووتانە هەمووی دێنێتە سەر مێز و ئابڕوت دەبات.

منیش وتم: عیزەدین چاو حیز بەڵێنی پێ داوم کە ئەو شتانە بۆ کەس باس نەکات.

ئێمە لەو قسانەدا بووین، نەوزاد دۆخین و سیڤانا لە ژووری خەوتن هاتنە دەرەوە، قۆڵیان لە قۆڵی یەکتری هەڵکێشابوو، بە حریت و حۆرەوە چوونە گەرماوەکە.

عیزەدین چاو حیزیش رووی لە ئەمجەد مەندیل کرد و پێی وت: بۆچی لە قسەی من تورە دەبیت، من بۆ تۆمە، بیست درام پارەیەکی کەم نیە، دەکاتە پەنجا دۆلاری ئەمریکی. مادام نایگێیت و لەگەڵی ناخۆیت و ناخۆیتەوە، بۆچی ئەو پارەیان دەدەیتێ.

لە تورەییان، ئەمجەد مەندیل جیرەی ددانەکانی دەهات و تووکی سەری هەڵچوو بوو، نیوچەوانی ببووە دوو ئەنگوست، برۆی جۆت ببوو، چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوون، دەتوت خوێنیان تێ زاوە، بە غەزەبەوە سەیری عیزەدین چاو حیزی کرد و مرەیەکی کرد و چووە ژووری نووستن و بە توندی دەرگاکەی لە دوای خۆی داخست و تاکو بەیانی نەهاتە دەرەوە.

کە نەوزاد دۆخین و سیڤانا لە گەرماو هاتنە دەرەوە، عیزەدین چاو حیز رووی لە نەوزاد دۆخین کرد و پێی وت: دەڵێی تازە بە زاوا دەبی، زۆرتان پێ چوو، لە ژوورەوە چیتان دەکرد. زۆری نەمابوو زەوقم تێك بچێت و کێرم بنیشێتەوە.

ئەمەی وت و دەستی سیڤانای گرت و بردیە ژووری نووستن و دەرگاکەیان داخست. بەڵام زۆریان پێ نەچوو، بە چاو تروکانێك،

هەردووکیان هاتنە دەرەوە. سیڤانا هیچی لەبەر نەبوو، جەستەی هەموو رووت بوو، بەڵام عیزەدین چاو حیز دەرپێیەکی کورت و فانیلەیەکی بێ قۆڵی لە بەر دابوو.

ڕووم لە عیزەدین چاو حیز کرد و پێم وت: جوو فسی. نەکردووە، چ زوو هاتنە دەرەوە. ناکات بڵێی گانیشم کردووە!

کە وام پێ وت، کۆندۆمەکەی بەرز کردەوە و وتی: ئەگەر بڕوا ناکەیت، سەیری ئەم کۆندۆمە بکە، بزانە چەند ئاوم تێ کردووە.

کۆندۆمەکەی دەستی دەتوت میزەڵدانی تەقیوە، لاستیکەکەی بەیەکەوە نووسابوو، لەوە نەدەچوو ئاوی تێ کردبێت. پێم وت: دەمێکە گاڵتە بە ئەمجەد مەندیل دەکەیت، کەچی دەرچوو تۆش لەو باشتر نیت، مادام ئاوت نەماوە، ئەم فشە فشەت لە چیە؟

کە وام پێ وت، سەری خۆی نزم کرد و بە شەرمەزاریەوە وتی: خۆشم نازانم بۆچی وام بە سەر هاتووە. جاران بە بێ حەب کێرم هەڵدەستا و ئاویشم زۆر بوو، کەچی ئێستا بە زەبری حەب کێرم هەڵدەستێ و ئاویشم نەماوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: برات نەبێت، بە بێ حەب و ڤیاگرا کێرم هەڵدەستێت و یەك پەقرەج ئاویشیان بۆ تێ دەکەم.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: دەك رووت رەش بێت، لەگەڵ خۆت و درۆت. ئەگەر تۆ راست دەکەیت، بۆچی ژنە بچووکەکەت لە دادگا شکایەتی لێ کردیت و لە بەردەم دادوەر و ئامادەبووان، وتی تا بەیانی قوونی خۆیم تێ دەکات و سەرجێییم لەگەڵ ناکات.

کە عیزەدین چاو حیز ئەمەی وت، نەوزاد دۆخین بە تورەییەوە وتی: خەتای خۆم بوو، تۆم لەگەڵ خۆم هێنا، لە باغی شار پێیان

وتم (ئەم عیزەدین چاو حیزە بە قسە و قسەلۆکە، گەشتی لەگەڵ مەکە، هەموو عەیب و عارت بە گۆڕێ وەردەکات).

لەم قسانەدابووین، زەنگی مۆبایلەکەم لێیدا، جۆرج لە سەر خەت بوو، هەلم گرت و دەنگی مۆبایلەکەشم بەرز کرد، وتی: ژنتان ناوێ بۆتان بێنم؟

منیش وتم: نەخێر نامانەوێ، شێخ فەرهاد سێ ژنی جوانی بۆ ناردووین.

ئەویش وتی: بە چەند لەگەڵیان رێك کەوتوون؟

وتم: شێخ فەرهاد وتی یەکی تەنها بیست درامیان بدەنێ.

کە وام وت، بە تورەییەوە وتی: شێخی چیە، شێخی قەحپانە، رسقی ئێمەی بریوە، هەر گەشتیارێك لە کوردستان دێتە ئێرە، ژمارەی تەلەفۆنی لەشفرۆشەکانیان دەداتێ، لێناگەڕێت دوو درامان لەو ژنانە دەست کەوێت.

## هانرا پتوتیان هوراپیراك

ڕۆژی دواتر دوای خواردنی نانی بەیانی، چوینە سەنتەری شار و لە دوکانی یەعقوب گۆشتفرۆش گەڕاین، نەمان دۆزیەوە. تەلەفۆنم بۆ فەرهاد کرد ناونیشانەکەمان پێ بڵێ، وتی: منیش لە ئێریڤانم، ئەو شوقەیەی گرتوومانە، لە سەنتەری شار نزیکە.

ئەمەی وت و ناونیشانی گۆشتفرۆشەکەی جارێکی تر پێ دایەوەو وتی: تا ئێمە دێین، پیاسەیەك بکەن و بە گوێرەی ئەم ناونیشانە بە دوای بگەڕێن، دڵنیام دەیدۆزنەوە. ئەگەر نا، کە نانمان خوارد ئێمەش دێینە مەیدانی کۆماری و بەیەکەوە دەچین.

ئەمجارە بە وردی چاومان لێ گێڕا، نەوەستاین، تا دۆزیمانەوە. دوکانی یەعقوب گۆشتفرۆش دوکانێکی گەورە بوو، چەند کەسێك کاریان تێیدا دەکرد. کە سڵاومان لێ کردن، یەکێك لە کارمەندەکان، کوڕێکی گەنجی باڵا بەرزی قژ لوول بوو. چەقۆیەکی گەورە و نیو کەلەشی بەرخی بە دەستەوە بوون دەیهێنا سەر تەختە تا پارچە پارچەی بکات. کەلاشەکەی دانا و بە زمانی کوردی کرمانجی سڵاوی لێ وەرگرتینەوە و وتی: خێر هاتن سەر چاڤا.

کە بە کوردی قسەی لەگەڵ کردین، زۆر کەیفم هات، وتم: دیارە تۆش کوردی، خەڵکی ئێرەیت؟

وتی: ئەز ئێزدیم.

منیش وتم: ئێمەش کوردین، خەڵکی کوردستانی عێراقین. لای ئێمە بە ئێزدییەکان دەڵێن کوردی رەسەن.

کە وام وت، بە دەنگێکی بەرز وتی: ئەز نەکوردم، ئەز ئێزدیمە.

کە وای وت، ئەمجەد مەندیل سەری هێنا ژێر گوێم و بە دەنگێکی نزم پێی وتم: لەگەڵی پێدا مەچوو، ئەوانە کەی کوردن، ئێمە بە زۆری ئەوانمان بە کورد داناون، ئەی گوێت لێ نەبوو، میر تەحسین بەگی میری ئێزدیانیش پێش ئەوەی بمرێت وتی: (ئێمەی ئێزدی کورد نین، ئێمە نەوەی ئێزیدخانین و ئێزدی هەم نەتەوە و هەمیش ئایینمانە).

منیش وتم: ئەگەر بمزانیبا پێی ناخۆشە، وام پێ نەدەوت. کورد بێ و کورد نەبێ بەئێمە چی، ئێمە پارەی خۆمان دەدەین، خۆ بە خۆرایی گۆشتمان ناداتێ.

نەوزاد دۆخینیش پێی وت: کیلۆی گۆشت بە چەندە؟

وتی: گۆشتی گۆلك بە سێ درام و گۆشتی بەرخیش بە پێنج درامە.

ئەویش وتی: رانێکمان بۆ لەو کەلاشە بەرخەی بەر دەمت لێ بکەوە و بزانە دەکاتە چەند.

دوای ئەوەی رانێکی لێ کردەوە و لە سەر تەرازووەکەی دانا وتی: دوو کیلۆ و شەش سەد گرامە، دەکاتە سیانزە درام.

عیزەدین چاو حیز گۆشتەکەی وەرگرت و وتی: من دەگەرێمەوە شوقە، لەگەڵتان نایەم بۆ مەیدانی کۆماری. تا ئێوە دەگەرێنەوە، منیش خواردنەکە ئامادە دەکەم و ئێوارە لەگەڵتان دێمە دەرەوە.

ئەمەی وت و رۆیشـــت. ئـــێمەش بـــۆ مەیـــدانی کۆمـــاری شـۆڕبووینەوە. لە بەردەم نـافورەکە لە سـەر کورسـیێك دانیشـتین، چاوەڕێی فەرهادمان کرد.

کە فەرهاد هـات، پیاوێکی لەگەڵ بـوو، لە تەمەنی خۆیدا بـوو.بە ئێمەی ناساند و وتی: ئەم برادەرەم نـاوی نەوزاد دۆخینە و هـاورێی منـداڵیمە، پـێکەوە لە گەڕەکی تەعجیـل گەورە بـووین. تـا خوێنـدنی ئامادەییشمان تەواو کرد، هەر بە یەکەوە بووین، لە زانکۆی بەغداد ناومان گەڕایەوە، ئەو لە کۆلێژی زانست بەشی کیمیا ناوی دەرچوو، منــیش لە بەشی فیزیـا وەرگـیرام. بەڵام پەیوەنــدیمان لەگەڵ یەك نەپچـــڕا و دوای دەرچوونیشـــمان لە کـــۆلێژ، هەردووکمـــان لە پەروەردەی هەولێر دامەزراین.

منیش وتم: تۆ لە ئێمە شارەزاتری، زۆر بۆ ئێرە هاتوویت،ئێرە بە زمانی ئەرمەنی چی پێ دەڵێن؟

وتی: ئێرە مەیدانی کۆماریە، بە زمانی ئەرمەنی پێی دەوترێ (هانرا پتوتیـان هـورا پـیراك) هەنـدێکیش پـێی دەڵـێن (گۆڕەپـانی ئـازادی)، چـونکە شـەوان کـوڕو کـچە گەنجەکانی ئەم شـارە هەروەهـا ژنـان و پیـاوان و گەشـتیارانیش بـۆ بە سـەر بـردنی کاتێکی خـۆش دێـنە ئـێرە، هەروەهـــا ژنە لەشفرۆشـــەکان و هاوڕەگەزبازەکـــانیش دێـــنە ئەم گۆڕەپانە و بە دوای نێچیر دەگەڕێن.

منیش وتم: پۆلیس نایانگرێت؟

وتی: ئەگەر کێشـە نەنێـنەوە، پـۆلیس تێکەڵیـان نابێـت. بە پـێی راپۆرتی کەناڵەکانی راگەیاندن نزیکەی دوو سەد و چل لەشفرۆش بە فەرمی لە ئەرمینیا نـاوی خۆیان تۆمار کـردووە، بەڵام زیـاتر لە پێـنج هەزار ژن لە کـاری لەشــفرۆشی تێـوەگلاون و زۆربەیـان لە شــاری

ئێریڤان کار دەکەن. پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش پێیان دەزانن، بە ئازادیی کەسی دادەنێن، بۆیە چاوپۆشیان لێ دەکەن.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: بەپێی ئەم ژمارە زۆرەیان بێت، دەبوو نرخی سێکسکردن زۆر کەم بێت. کەچی ئەو سێ ژنەی کە دوێنێ شەو بۆت ناردین، زۆریان لێ وەرگرتین.

ئەویش وتی: لێرە سێ جۆر لەشفرۆش هەن، لەشفرۆشەکانی سەر شەقام لە چاو ئەوانەی لە مالانن، یان ئەوانەی لە یانەی شەوان کار دەکەن، نرخیان کەمترە. بە گشتی نرخیان لە نێوان دە بۆ چل درامە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەو لەشفرۆشانە لە کوێ دەبیندرێن؟

ئەویش وتی: زۆربەیان لە شەقامی (باگریڤاند) لە نزیك یانەی شەوانی (چارلووت) و هەندێکیشیان لەم گۆڕەپانە لە نزیك هوتێل (ئەرمینیا ماریۆت) لە درەنگی شەودا دەبیندرێن. هەروەها لە یانەکانی شەواندا هەن و دوای کۆتایی هاتنی پرۆگرامەکان دێنە دەرەوە. بەڵام ئەوان پارەیەکی زیاتریان دەوێ، چونکە تەمەنیان بچووکترە و ناسکتر و جوانتریشن. هەندێکیش هەن، لەگەڵ خانەوادەکانیان دەژین، بە رۆژ لە فەرمانگە حکومیەکان و شوێنە بازرگانیەکان کاردەکەن، یان قوتابی زانکۆن، لە بەر سەختی ژیان شەوان ئەو کارە دەکەن. ئەوان داوای پارەیەکی زۆر دەکەن، چونکە لە کارەکە نوێن و زۆر سێکسییان لەگەڵ نەکراوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ژنێکمان لەوانە چۆن دەست دەکەوێ؟

ئەویش وتی: ژمارە مۆبایلی هەندێك لەو ژنانەم لایە، هەر کاتێك ویستتان، پەیوەندییان پێوە دەکەم و بۆتان دەنێرم. ئەگەر حەزیش

دەکەن ژمارەی مۆبایلی ئەوانتان دەدەمێ، بە ناوی من خۆتان پەیوەندییان پێوە بکەن.

ئەویش وتی: بۆچی زووتر وات پێ نەوتین. ئەگەر بمزانیبا، دوێنێ شەو داوای ئەوانمان دەکرد.

فەرهادیش وتی: وەکو وتم نرخی ئەوان گرانترە، لە نێوان سی بۆ چل درام داوا دەکەن، بە پارەیەکی کەم نایەن.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: لەشفرۆش هەر لەشفرۆشە، ئێمە بۆ گانمانە، خۆ نایانهێنین.

ئەویش وتی: وا نیە، تا لەگەڵیان نەخەون و نەیانگێن، نازانن جیاوازییان لەگەڵ ژنانی سەر شەقام چیە.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: بۆ من هیچ جیاوازی نیە، گرنگ ئەوەیە خۆمیان پێ بەتاڵ کەم.

نەوزاد دۆخینیش وتی: عیزەدین چاو حیز راست دەکات، بۆچی ئەو پارە زۆرە بدەین.

فەرهادیش وتی: هەقتانە وا بڵێن، دیارە پێشتر لە گوند کەرتان گاوە.

نەوزاد دۆخینیش بە پێکەنینەوە وتی: کە سەرباز بووم، لە بارەگای سریە بە هێستر خواردنم بۆ سەربازەکانی سەنگەرەکەمان دەگواستەوە. سەنگەرەکەمان لە سەر لووتکەی شاخێکی بەرز بوو، لە بارەگای سریە زۆر دوور بوو. تا دەگەیشتمە ئەوێ، دوو سێ جار هێسترەکەم دەگا.

کە وای وت، قسەکانی عەبدوڵا ئەفغانیم بیرکەوتەوە، جارێك وتی (لە ئێران لە سەردەمی رەزا شا، شوێنی تایبەتی هەبوو بۆ سێکسکردن لەگەڵ هێستر، نرخی ئەوان لە نرخی ژنان گرانتر بوو).
قسەکەی عەبدوڵا ئەفغانیم بۆیان گێڕایەوە، بە نەوزاد دۆخینم وت: بەو سیفەتەی کە تۆ هێسترت گاوە و شارەزاییت لێی هەیە، پێمان بڵێ گانی هێستر چ جیاوازیێکی لەگەڵ گانی تر هەیە؟

ئەویش وتی: لە بەر ئەوەی هێستر زاوزێ ناکاتن بۆیە قوزی زۆر تەسك و خۆشە.

کە وای وت، لە قاقای پێکەنینمان دا، ئەمجەد مەندیلیش رووی تێ کرد و وتی: شەرمیش لە خۆت ناکەیت، ئەم رووداوە قێزەونە بە شانازیەوە دەگێڕیتەوە؟

ئەویش وتی: بۆچی تۆ قەت کەرت نەگاوە؟

بەر لەوەی ئەمجەد مەندیل وەڵام بداتەوە، عیزەدین چاو حیز بە پێکەنینەوە وتی: من هێسترم نەگاوە، بەڵام کە لە گوند بووم، کەرم گاوە و چەندین جاریش جۆتکەی لێ داوم.

فەرهادیش وتی: توخوا بیبڕنەوە، ئێمە سەدان کیلۆمەترمان بڕیوە و بۆ ئێرە هاتووین تا هەوایەکی خۆش بگۆڕین، خۆ بۆ ئەوە نەهاتووین باسی هێسترگان و کەرگانمان بۆ بکەن.

منیش وتم: فەرهاد راست دەکات، با بزانین ئەم باڵاخانانەی کە لە چوار دەوری ئەم گۆڕەپانە دان، چین؟

فەرهادیش بە دەست ئاماژەی بۆ باڵاخانەیەکی سێ نهۆمی گەورە کرد، کەوتبووە پشت نافورەکانی گۆڕەپانەکەو وتی: ئەم باڵاخانەیەی

کە دەیبینن، مۆزەخانەی نیشتمانییە، لە ساڵی ١٩٢٠ دروست کراوە.

منیش وتم: پێتان چۆنە سەردانی بکەین؟

فەرهادیش وتی: من پێشتر بینیومە، ئەگەر ئێوە دەچن، بچن، ئێمەش دەچینە لای نافورەی سەماکەر و هەندێك لەوێ دادەنیشین و دوایی دەگەڕێینەوە شوقەکەمان. ئەگەر شەویش بەرنامەیەکی دیاریکراوتان نەبێت، وەرنە ئێرە، شەوان پڕی ژن و کچی جوان و نیمچە رووت دەبێ. لەشفرۆشەکانی سەر شەقامیش دێنە ئێرە و چاو لەو پیاوانە دەگێڕن کە بۆ رابواردن و سێکسکردن هاتوون.

ئەمجەد مەندیلیش وتی: ئەو ژنانە چون گانکەرەکان دەناسنەوە؟

ئەویش وتی: گانکەرەکان لە دوورەوە دیارن، چاو حیزن، بە بیانووی دانیشتن، یان سڵاوکردن، یان هەر بیانوێکی تر، لێیان نزیك دەبنەوە و بە سینگی رووت و جەستە سێسییەکانیان فرێویان دەدەن، بۆ سێکسکردن لەگەڵ خۆیان دەیانبەن.

کە وای وت، پێکەنینم هات، وتم: کێ کێ لەگەڵ خۆی دەبات؟!

وتی: رەنگە بەلاتەوە سەیر بێت کە وا دەڵێم، بەڵام شەو کە هاتیە ئێرە، بە چاوەکانی خۆت دەبینی چۆن ئەو پیاوانە وەکو مەڕ بە پێش خۆیان دەدەن و دەیانبەن.

وتی: ئێمە دەڕۆین، شەو لێرە دەتانبینینەوە.

من و نەوزاد دۆخینیش چوینە مۆزەخانەی نیشتمانی و تکیتی چوونە ژوورەوەمان بڕی. قوتابیانی قۆناغی بنەڕەتی پۆل پۆل لەگەڵ مامۆستاکانیان دەهاتن و تەماشای کەلوپەلە مێژووییەکانیان دەکرد.

مۆزەخانەکە چەند بەشێکی لە خۆی گرتبوو، دیارترینیان بەشی شوێنەوار و بەشی دراوە کانزاییە کۆنەکان بوو، هەروەها بەشی مێژووی کۆن و نوێ. زۆر کەل و پەل و ئاسەواری مێژوویی تێدا بوو. وەك ئەو چەکانەی کە بۆ بەرگری خۆیان بەکاریان هێناوە، هەروەها ئەو پارە کانزاییانەی کە لە رابردوودا بەکاریان هێناوە، لەگەڵ هەندێك گۆسکە و نووسینی سەر تاشە بەردەکان و کەلە سەری مرۆڤ و ئەو جل و بەرگانەی کە لە بەریان کردوون، بە تایبەتی میر و پاشاکانیان.

نزیکەی دوو کاتژمێر لە ناو مۆزەخانەکە سوڕاینەوە و وێنەمان لەگەڵ بەشێك لەو کەل و پەلانە گرت، کە نمایش کرابوون. دوایی هاتینە دەرەوە و گەڕاینەوە شوێنی حەوانەوەمان.

تا گەیشتینەوە کات درەنگ بوو، ئەمجەد مەندیل تەماشای تەلەفزیۆنی دەکرد و عیزەدین چاو حیزیش لە چێشتخانە بوو، خواردنی ئامادە دەکرد. کە چاوی بە ئێمە کەوت وتی: زۆرتان پێ چوو، لە برسان وەخت بوو دڵم ببورێتەوە، لە بەر ئێوە چێشتمان نەخوارد.

نەوزاد دۆخینیش وتی: بە خێرایی بە ناو مۆزەخانەکەدا گەڕاین، دەنا تا ئێوارە لە دیتنی کەلوپەلە مێژوویی و ئاسەوارە کۆنەکانی ناوی نەدەبووینەوە.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: لە کەیەوە بایەخ بە ئاسەوار و شتی مێژوویی دەدەیت؟

ئەویش وتی: بۆ لێم ناوەشێتەوە؟

عیزەدین چاو حیزیش وتی: نێرەکەر تاکو ئێستا لە کوێ بویت، چەند گەشتم لەگەڵ تۆ کردووە، جارێك نەم دیت بەلای ئەو شوێنانەدا بچیت.

منیش وتم: ژیان هەمووی سێکس نیە، ئەم وڵاتە گەلێك شوێنی خۆش و گرنگی تیایە، ئەگەر رازی بن بەیانی سەردانی رادیۆی ئێریڤان دەکەین.

نەوزاد دۆخینیش وتی: من لەگەڵت دێم، خۆمان بە کارمەندەکانی رادیۆکە دەناسێنین و هەندێك وێنەشیان لەگەڵ دەگرین، لە فێسبوك بڵاویان دەکەینەوە، با نەڵێن ئەوانە تەنها بۆ رابواردن چوونە.

دوای ئەوەی نانی نیوەڕۆمان خوارد، هەندێك چاومان گەرم کرد و ئێوارە کە هەستاینەوە چایەمان لێ ناو لەگەڵ بسکیت و چەرەزات بە دەم قسە کردنەوە خواردمان. ئەمجەد مەندیلیش چووە گەرماوەکە و دوشێکی وەرگرت و لە سوچێکی هۆلەکە بەرماڵەکەی راخست و نوێژی ئێوارەی کرد.

عیزەدین چاو حیزیش پێی وت: ئەم نوێژە چیە؟

ئەویش بەتوڕەییەوە وتی: مەگەر موسڵمان نیم، بۆچی ئەم پرسیارە دەکەیت؟

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئێرە و نوێژکردنیان نەوتووە، تۆ دوێنێ شەو لەگەڵ ژنی لەشفرۆش بە فانیلە و دەرپێی کورت دەسوڕایتەوە، کەچی ئێستا لێمان بوویت بە سۆفی و نوێژ دادەبەستیت!

کە وای پێ وت، بە توڕەییەوە بەرماڵەکەی پێچایەوە و رووی لە من کرد و وتی: ئەگەر لە بەر تۆ نەبا نەدەهاتم. برادەرانی باغی شار

پێیان وتم ئەم عیزەدین چاو حیزە زمانی راناوەستێ، هەموو قسەیەك دەکات.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: قسەیەکی خراپم نەکردووە، تەنها وتم ئەم نوێژە چییە؟

ئەویش وتی: ئێوە فەرمەسۆنن، نوێژ ناکەنن هەقتان لە من نەبێ، من لەگەڵ ژنانیش دەبم و نوێژیش دەکەم.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: من حەجم کردووە و نوێژیش دەکەم، لە مانگی رەمەزانیش بە رۆژوو دەبم. بەڵام کە بۆ رابواردن دەچمە دەرەوەی وڵات، تا دەگەڕێمەوە نوێژ ناکەم.

نەوزاد دۆخینیش وتی: منیش وەکو عیزەدین چاو حیز تا لە ماڵەوەم نوێژ دەکەم، بەڵام لە شوێنی وا نوێژ ناکەم. ئاخر شتی وا چۆن دەبێ، ئێمە بۆ رابواردن هاتووین، بۆ نوێژ و تاعەت نەهاتووین.

ئەمجەد مەندیل هیچ وەڵامی نەوزاد دۆخینی نەدایەوە و چووە ژووری خەوتن و بە توندی دەرگاکەی لە دوای خۆی داخست.

منیش رووم لە عیزەدین چاو حیز کرد و پێم وت: ئەوە بە راستیتە حەجت کردووە؟

وتی: بۆ لێم ناوەشێتەوە؟

منیش وتم: تۆ هەموو ژیانت مێ بازییە، هەر لەو کاتەی لە بەغداد بوویت، تا گەڕانەوەت بۆ کوردستان، هیچ نەمایە نەیکەیت.

ئەویش وتی: لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابردوو چوومە حەج.

ئەمەی وت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و هیچ قسەی تری نەکرد.

منیش وتم: ئەم هەناسە قووڵە چی بوو، دەڵێی لەو ڕەفتارانەی ئێستات پەشیمانی؟

وتی: پەشیمان نیم، خەفەت بۆ ئەوە دەخۆم کە چۆن لە سعودیە ژنە لوبنانییەکەم نەگا.

منیش وتم: منیش وتم: تۆ باسی چی دەکەیت؟

ئەویش وتی: لەو باڵاخانەیەی کە لێی دابەزی بووین، ژنێکی لوبنانی لێ بوو، ژنەکەی شوفێری پاس بوو، لە بەیانی زووەوە دەڕۆیشت و تا درەنگی شەو نەدەگەڕایەوە. ڕۆژێك لە خەودا مابووم، ئەوانەی کە لە ژوورەوە لەگەڵم بوون، بۆ نوێژکردن چووبوون. ژنە لوبنانیەکە کە زانی بە تەنها لە ژوورەوەم، هاتە لام و چاوەکانی خستە سەرم، عەزیەیەکی سووری لەبەردا بوو، تا ناوقەدی هەڵکردبوو، سینگی رووت بوو، سوخمەی لەبەر نەبوو، بە ئەنقەست خۆی دەچەماندەوە تا مەمکەکانی بە دەر کەوێت. زۆرم حەز چۆیە، لە خۆشیان ئاو بە دەمم رانەدەوەستا، ویستم دەستی بۆ درێژکەم و لە سەر تەختەی خەوتن درێژی کەم، یەکێك لەو حاجیانەی کە لەگەڵم بوو، لەو کاتەدا هاتە ژوورەوە، کە چاوی پێمان کەوت، سەری خۆی لەقاند و لە بەر خۆیەوە وتی (لاحول ولا قوه الا بالله).

منیش وتم: ئەی تۆ چیت کرد؟

ئەویش وتی: ژنەکە چاوێکی لێ نوقاندم و ڕۆیشت. ئەگەر ئەو بە سەرماندا نەهاتبا، شل ببووم، زۆری نەمابوو بیقەومێنم.

منیش وتم: ئەی برادەرەکەت هیچ قسەی تری نەکرد؟

وتی: پێی وتم (گۆڕی پێغەمبەری خودا لێرەیە، هیچ نەبێت بۆ ڕێزگرتن لە پیرۆزی ئەو زاتە موبارەکە چۆن کارێکی وەها دەکەیت).

لەگەڵ قسەکانی عیزەدین چاو حیز بیرەوەرییەکی کۆنی خۆمم بیرکەوتەوە، چەند ساڵێك لەوەو پێش کە عومرەم هێناوە، منیش لەگەڵ بێوەژنێك و کچەکەی کەوتمە هەمان بارو دۆخەوە. بە پێکەنینەوە ڕووداوەکەم بۆیان گێڕایەوە، وتم: لە ساڵی ٢٠١٠ گەشتی عومرەم کرد، لە شاری مەدینە بە ڕێکەوت لەگەڵ سێ پیاوی بە تەمەنی شاری هەولێر بەیەکەوە لە ژوورێك دەخەوتین. ڕۆژانە بە یەکەوە سەردانی شوێنە ئایینییەکانمان دەکرد و لە مزگەوتی پێغەمبەریش نوێژمان دەکرد. بێوەژنێکی تەڕلووس خۆی و کچە گەنجەکەی ئەوانیش لەگەڵ گروپی ئێمە بوون. هەر کاتێك بۆ سەردانی شوێنە ئایینییەکان دەڕۆیشتین، بێوەژنەکە خۆی لێ نزیك دەکردمەوە و بە کچەکەی ئاوی ساردی بۆ دەناردم. ڕۆژێك لە کاتی گەڕانەوەمان وتی (لەمەودوا کە دەچیتە بازاڕ، لەگەڵ دەستی خۆت خواردن بۆ خۆت و ئێمە بکڕە و بە یەکەوە دەیخۆین).

کە وام وت، نەوزاد دۆخین بە پێکەنینەوە وتی: دیارە ئەو حەج و عومرەیەش خێری پێوەیەوە، چی دەڵێن گەشتی داهاتوومان بۆ ئەوێ بێت؟

وتم: منیش وەکو عیزەدین چاو حیز ئەو پیاوەی کە لەگەڵم بوو، نەیهێشت لێیان نزیك بمەوە، وتی (ئاگاداری خۆت بە، زۆر لەو دایك و کچە نزیك مەبەوە، نیازیان خراپە، لە چاوەکانیان دیارە بە تەمای شتێکن. ئەو بێوەژنە تەڕلوسە، یان دەیەوێ خۆیت پێ ساغ بکاتەوە، یانیش کچە خێڵ و خێچ. تۆ پیاوێکی خێزانداریت، چیت لەو ژنە دەستی دووە و ئەو کچە چاو خوار و خێچە داوە).

نەوزاد دۆخینیش وتی: ناکات تۆش وەکو عیزەدین چاو حیز ئەو هەلە زێرینەت لە دەست دابێت؟

منیش وتم: ئەو دایك و کیژە زۆر گوناح بوون، بێکەس دیار بوون، زۆر دڵیان بە من خۆش بوو، لە شەڕی ئەو پیاوانەی لەگەڵم بوون، خۆم لێ دوور خستنەوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: ئەو بێوەژنانەی کە بە گەنجی لێیان دەقەومێ، زۆر حەزیان لە گانە، هەندێکیان مێرد بە پیاوی بە تەمەن دەکەن، هەندێکیشیان سەر بە هەوێ مێرد دەکەن. بەڵام تیاشیاندا هەیە هاوڕێیەك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و هەرکاتێك حەزی لێ بێت، سێکسی لەگەڵ دەکات.

منیش وتم: وەك شارەزایەك لە بێوەژنان قسە دەکەیت، دەڵێی لەگەڵیان نان و پیازت خواردووەن وا بە جوانی باسیان دەکەیت.

عیزەدین چاو حیزیش وتی: بۆ نازانیت ئەویش بێوەژنێکی لە خۆی گەورەتری بە سەر ژنەکەیدا هێناوە؟

ڕووم لە نەوزاد دۆخین کرد و پێم وت: عیزەدین چاو حیز ڕاست دەکات؟

وتی: بەڵێ وایە، ئەو بێوەژنەی کە هێناومە، خزمی خۆمە، ماوەیەکی زۆرە پیاوەکەی مردووە، کوڕ و کچەکانی گەورەن و ماڵی خۆیان هەیە. زۆرجار پێی دەوتم (ئەگەر کەسێکی باشت لێ هەڵکەوت، مێردی پێ دەکەم) منیش پێم وت ئەگەر بە من ڕازی بیت، دەتهێنم. بەڵام هیچم نیە لێت خەرج کەم. ئەویش وتی (هەموو شتێکم هەیە، لە خانوو تا ئۆتۆمبێل و زێڕ و پارەم هەیە، تەنها تۆ بمهێنە هیچم لێت ناوێ) ئەوەبوو منیش بە نهێنی بە

مەلایەك مارەم کرد و حەفتەی شەوێك لەگەڵی دەبم و شەوەکانی تریش لەگەڵ ژنی کۆنم دەبم.

منیش وتم: مادام کوڕ و کچەکانی چونەتە ڕێی خۆیان، مانای وایە بێوەژنێکی زۆر بە تەمەنە.

ئەویش وتی: چوار ساڵ لە خۆم گەورەترە.

منیش بە پێکەنینەوە وتم: کەواتە تلپی تەڕی تیا نەماوە!

عیزەدین چاو حیزیش وتی: ئەو نەوزاد دۆخینە بە پیرەژنان فێرە، لە ئازربایجانیش بە یەکەوە بووین، شەوێك پیرەژنێکی سەر و بەر سپی لەگەڵ خۆی هێنایەوە و لەگەڵی خەوت.

وتی: تۆ نازانیت گانی ئەو پیرێژنانە چەند خۆشە، ئەوان زۆر تامەزرۆن، ئەو خۆشیەی ئەوان دەیدەن، ژنە گەنجەگان لێی نازانن.

منیش وتم: ئەوە لۆیە شازادەی جێنشینی بەریتانیاش وەکو تۆ حەزی چۆتە پیرەژنێك و دەڵێ جارێك لە بارێك بوم، دەمخواردەوە، پیرەژنێکم بینی، حەزم چوێ و بردمە دواوە و سێکسم لەگەڵ کرد. شازادە هاری ئەم قسەیەی لە کتێبی بیرەوەریەکانی گێڕاوەتەوە و بەوەش خانەوادەی پاشایەتی لە بەریتانیا زۆر نیگەران بوون و سەرکۆنەی ئەمیر هاریان کرد و وتیان (ئەمیر هاری دەیەوێ بەو قسانە ئابرووی خانەوادەکەمان ببات، لە پێناو دەسکەوتێکی دارایی ئەم قسانە دەکات).

عیزەدین چاو حیزیش رووی لە نەوزاد دۆخین کرد و وتی: باسی ئەو هونەرمەندە بێوەژنە بەتەمەنەی شاری هەولێرمان بۆ بکە، کە ناوە ناوە لەدوات دەنێرێت و سواری خۆییت دەکات.

کە بینیم ئەمجەد مەندیل زۆر تورە بووە، خەریکە ئەتەقێتەوە، وتم: ئێوە نازانن بۆچی ئەو ژنانە ناگێت، تەنها یارییان لەگەڵ دەکات.

محەمەد کۆسەس وتی: بۆچی؟

بە تەوسەوە وتم: ئەو وەکو ئێمە نییە، کەسێکی نوێژکەرە و لە خودا دەترسێ، نایەوێ زینا بکات.

کەوام وت، محەمەد کۆسە رووی تێ کردم و وتی: ئەی تۆ چیت لێ دەکردن، ناکات تۆش وەکو ئەو تەنها یاریت لەگەڵدا کردبن بۆیە وا پشتگیری دەکەیت؟

وتم: هەر کەسێك ئازادە چۆن بیر دەکاتەوە، منیش وەکو ئەمجەد مەندیل لەگەڵ ئەوە نیم بیانگێم.

ئەویش وتی: ئەگەر نەیانگێیت، خۆ بۆنیشیان ناکەیت؟!

وتم: تەنها حەزم لێیە لەگەڵیان دانیشم و بە یەکەوە بخۆین و بخۆینەوە و بیاندوێنم.

ئەویش وتی: بۆچی تۆ لە زمانیان دەزانی؟

وتم: لە رێگەی بەرنامەی گۆگڵ ترانسلێتەرەوە قسەکانم وەردەگێرا سەر زمانی ئەرمەنی، یان ئینگلیزی.

ئەویش وتی: زمانی تورکی و فارسیشی تیایە؟

وتم: هەموو زمانەکانی تیایە بە زمانی کوردیشەوە.

کەوام وت، وتی: مـادام ئێـوە بـۆ ژن هـاتوون، بـۆچی وا دوور دەڕۆن، لە ئـێران ژنی لەشـفرۆشی زۆری لێـیە، لە سـنوور قاچتـان ئاودیو کەن، پڕە لەو ژنانەی کە ئێوە دەتانەوێ.

ئەمەی وت و رووی لە ئەمجەد مەندیل کرد و پێی وت: ئەوەیان بۆ تـۆش باشـە، ئەگەر حەز بکەیت دەتـوانی ئەو ژنەی دەتەوێ بـۆ چەند رۆژێك لە خۆتی مارە بکەیت و بە حەڵاڵی بیگێیت.

نەوزاد دۆخینـیش وتی: مـاوەیەك بەر لە ئێسـتا لە شـاری ورمێ چوومە گەڕەکی (بالو) لەو گەڕەکە لەو ژنانەی زۆر لێیە. هـاوڕێیەکم خانووی لە وێ هەیە، بە سیغە ژنێکی لێ مارە کردم، شەو و رۆژێك لەگەڵی مـــامەوە، دوایی بەجـــێم هێشـــت و گەڕامەوە هەرێـــمی کوردستان.

مـــحەمەد کۆســـەش وتی: پێتـــان چـــۆنە دوو شـــەو لە ورمێ بمێنینەوە، لەو ژنانە زۆر دەناسم، ژنی جوانتان بۆ دەهێنم.

عـیزەدین چـاو حـیزیش وتی: منـداڵەکانم نـازانن کە هـاتوومەتە ئەرمینیا، بەناوی پشکنینی پزیشکی بۆ ئێران هاتووم، ئەگەر زیاتر دوا بکەوم، گومانم لێ دەکەن.

نەوزاد دۆخینیش وتی: من دەمێنمەوە، با بزانین کۆسەی گەواد ژنی چۆنم بۆ دێنێ.

کە گەیشـتینە شـاری تەبرێز، مـحەمەد کۆسـە ئۆتـۆمبێلەکەی لە بەردەم ریستورانتێك راگرت و وتی: وەرنە خوارەوە، ئەوە ریستورانتی ئەرستۆیە، بە ناوبانگترین و باشترین ریستورانتی تەبرێزە، نانی نیوەڕۆ لێرە دەخۆین.

ڕیستورانتەکە لە سەر دیزایین و شێوازێکی نوێ لە دەرەوەی شاری تەبرێز دروست کرابوو، لە ناوەوە لە چەند حوجرەیەکی شەش نەفەری پێك هاتبوو، لە جیاتی کورسی و مێز، میوانەکان لە دەوری خوانێك بە چوار مەشقی لێی دادەنیشتن.

بەر لەوەی خواردن بێت، زەڵاتە و سەوزە و ماستاو و کولێرەی گەرمییان بۆ هێناین، ماوەیەکی زۆر بوو ماستاوی وەها بەتام و بە لەزەتم نەخواردبووەوە. نزیکەی نیو کاتژمێر لەوێ ماینەوە، دوایی بەرە و شاری ورمێ بەڕێکەوتین و لەوێشەوە بۆ شاری خانێ و مەرزی تەمرچین ڕۆیشتین.

بەرلەوەی بگەینە ورمێ، نەوزاد دۆخین پەشیمان بۆوە کە دوو شەو بمێنێتەوە، وتی: منیش لەگەڵتان دەگەڕێمەوە، چونکە دەبێ دوای حەفتەیەکی تر لەگەڵ هاوسەرەکەم بۆ سەردانی پزیشك بێمەوە.

کە گەیشتینە سەر سنوور، لە بەر دەرگای مەرزی تەمرچین چاوم بە جادر کۆمبارسی هاوڕێی مندالیم کەوت، عەبدوڵا شێخانی و ماهیر کرمانجی لەگەڵ بوو. کە چاوی بە من کەوت، لە خۆشیان شاگەشکە بوو، وتی: بەر لەوەی بێم، لێم پرسیت وتیان چوویت بۆ ئەرمینیا.

منیش وتم: بۆچی هاتووی؟

وتی: بۆ سەردانی پزیشك هاتووم.

منیش وتم: چاکە بە تەنیا نیت، دوو کەست لەگەڵ دایە.

ئەویش وتی: ئەوان بۆ ئیشێکی خێر هاتوون، لێرە بەجێم دەهێڵن و دەچنە شاری بۆکان.

منیش وتم: دیارە بۆ سەر گۆڕی حەسەن زیرەك دەچن؟

وتی: لە خۆیان بپرسە با پێت بڵێن بۆچی هاتوون.

منیش بە عەبدوڵا شێخانیم وت: ئەگەر بۆ سەر مەزاری حەسەن زیرەك نەهاتبن، ئەی بۆچی هاتوون؟

وتی: بۆ خوازبێنی خاتوو مانی بۆکانی هاتووم.

منیش وتم: بۆ کورەکەت؟

وتی: نەخێر بۆ خۆم.

منیش وتم: ئەو زۆر لە تۆ بچووکترە، مێردت پێ دەکات؟

بە پێکەنینەوە وتی: خۆشەویستمە، ماوەیەك پێش ئێستا لە هەولێر بوو، خانوێکم بۆ گرتبوو، خۆم کرێیەکەم لەجیاتی دەدا.

ماهیر کرمانجیش بێ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم وتی: من لە جیاتی کەسوکاری لەگەڵی هاتووم، هەر لەوێش مارەی دەکەین و منیش دەبمە شایەت لە سەر مارەکردنیان لە یەکتری.

ئەوەی وت و لەگەڵ عەبدوڵا شێخانی خواحافیزیان کرد و ڕۆیشتن.

جادر کۆمبارسیش وتی: ئەگەر بە پەلە نیت بۆ گەڕانەوە، لەگەڵم بمێنەوە، کە لە سەردانی پزیشکیش بووینەوە، سەردانی شارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش دەکەین و بە یەکەوە هەوایەك دەگۆڕین.

منیش وتم: هەرچەند پێشتر زۆربەی ئەو شارانەم بینیوە، بەلام لە بەر دڵی تۆ دەمێنمەوە و بە تەنیا جێت ناهێڵم. سەردانی مەزاری حەسەن زیرەکیش دەکەین و دوایی دەچینە شاری سەقز و بانە و لەوێشەوە بە سەردەشت تێدەپەڕین و دەگەڕێینەوە خانێ.

کە وام پێ وت، زۆر کەیفی هات، وتی: تۆ وەکو براکانم خۆشەویستی، دەمزانی دڵم ناشکێنی و لەگەڵم دەمێنیتەوە.

نەوزاد دۆخینیش وتی: بڕیار بوو من بمێنمەوە، کەچی تۆ دەمێنیتەوە.

ئەمەی وت و لەگەڵ ئەمجەد مەندیل و عیزەدین چاوحیز بەیەکەوە خواحافیزیان لێ کردم و لە مەرزی تەمرچین بۆ دیوی هەرێمی کوردستانْ ئاودیو بوون. من و جادر کۆمبارسیش لەگەڵ محەمەد کۆسە بۆ شاری ورمێ بەرێکەوتین.

لە ناو ماشێنەکە محەمەد کۆسە پرسی: ئەوە بۆچی نازناوی کۆمبارست دەقەبەڵ کردووە؟

منیش وتم: چونکە خۆی شانۆکارە و بیست ساڵ زیاترە لە شانۆ کار دەکات و سیناریۆ دەنووسێ، کەچی هێشتا ڕۆڵێکی سەرەکی وەرنەگرتووە، دەرهێنەرەکان لە بەر بێ توانایی هەمیشە ڕۆڵی کۆمبارسی پێدەدەن. تەنیا جارێك ڕۆڵێکی سەرەکی لە درامایەکی تەلەفزیۆنی بە داوەتێکی دەرهێنەر وەرگرت ئەویش ساڵانی هەشتاکان بوو، تەلەفزیۆنی بەغداش مۆڵەتی دەقەکەی نەدا و ریسەکەی لێ بووەوە خوری.

محەمەد کۆسەش ڕووی لە جادر کۆمبارس کرد و وتی: جا حەیف بۆچی لەوانی تریشدا دەرهێنەرەکان داوەت ناکەیت؟

پێش ئەوەی جادر کۆمبارس وەڵام بداتەوە، من وەڵامم دایەوە و وتـم: فەقـیرەی کـرێچییە و توانـای دارایی کەمە، ئەو دەرهێـنەرە چاوچنۆکانە بەو تێرناکرێن.

محەمەد کۆسە کە زانی جادر کۆمبارس بۆ پشکنینی پرۆستات و گورچیلە و چاوەکانی بۆ لای پزیشك هاتووە، وتی: لە شاری تەبرێز دکتـۆرێکی بەناوبـانگی لێـیە، پسـپۆری نەخۆشـیەکانی پرۆسـتات و گـورچیلەیە. ئەگەر بـتەوێ ئێسـتا پەیوەنـدی پێـوە دەکەم و بـۆت حجز دەکەم.

جـادر کۆمبارسـیش وتی: ئەگەر دڵنیایـت پزیشـکێکی باشـە، تەلەفۆنی بۆ بکە، راستەخۆ بۆ ئەوێ دەچین.

محەمەد کۆسەش مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و تەلەفۆنی بۆ کەسێك کرد و بە زمانی فارسی قسەی لەگەڵ کرد.

جـادر کۆمبارسـیش رووی لە مـحەمەد کۆسـە کـرد و پـێی وت: تێنەگەیشتم چیت پێ وت؟

ئەویـش وتی: پـێم وت پەیوەنـدی پێـوە بکـات و پـێی بـڵێ زوو بەرێمان بکات.

بەم شـێوەیە، کـاتژمێر هەشـت و نیـوی شـەو گەیشـتینە شـاری تەبرێـز و چـوینە نـۆرینگەی ئەو پزیشـکە. تـا گەیشـتینە ئەوێ، پزیشـکەکە زۆربەی نەخۆشـەکانی بەڕێ کردبـوو، تەنهـا ئـێمە و سێ نەخـۆش مـابووین. مـحەمەد کۆسـە بە تـورکییەکی سـەقەت قسـەی لەگەڵ سـکرتێری پزیشـك کـرد. وتی بە پزیشـك بـڵێ لە عـێراقەوە هـاتوون، زوو بەرێمـان بکـات. بەڵام سـکرتێرەکە هـیچ بـایەخی بە قسـەکانی مـحەمەد کۆسـە نەدا. وەك ئەوە وابـوو، کە نەیناسـێت.

محەمەدیش سەیری من و جادر کۆمبارسی کرد و ئارەقەی شەرمەزاری لە نیوچەوانی دەتکایەوە.

بە هەرحاڵ، نۆرەمان هات و چووینە لای پزیشکەکە، جادر کۆمبارس کەمێك زمانی تورکی دەزانی، باسی تەندروستی خۆی بۆ کرد.

سەیری بڕوانامەی پشت سەری پزیشکەکەم کرد، هەڵگری بڕوانامەی ماستەر بوو، لە نەخۆشی گورچیلە و میزڵدان. بە محەمەد کۆسەم وت: لە ورمێ دەیان پزیشکی لە سەرووی پسپۆرییەوەی لێیە. بۆچی ئێمەت بۆ ئێرە هێنا، مادام پزیشکی لە سەرووی پسپۆری ناناسیت؟

کە وام پێی وت، نەیزانی چی بڵێت، لە شەرمان رنگی سوور هەڵگەڕا و زمانی تەتەڵەی دەکرد، شێرێك لەوێ و ریوییەك لە وێ، زۆر خۆی هێناو برد، نەیتوانی درۆیەکەی پینە بکات.

دوای ئەوەی پزیشك پشکنینی بۆ کرد، رەچێتەیەکی دایە و هیچ باسی پشکنینی خوێن و سۆنار و قەستەرەی نەکرد.

منیش وتم: ئەقڵم ئەم پزیشکە ناگرێت، بۆردی دکتۆرای نییە، لە شاری ورمێ دکتۆری زۆر لەو باشتر هەن. ئەگەر بە قسەم دەکەیت، دەرمانەکان مەکڕە، ئێستا دەچینە شاری ورمێ، ئەم شەو لە هوتێل دەخەوین و بەیانی سەردانی دکتۆرێکی لە سەرووی پسپۆرییەوە دەکەین.

جادر کۆمبارس بیرۆکەکەی پێ باش بوو، وتی: لە بەر تۆ دەنگم نەکرد، ئەگینا زوو زانیم ئیشی ـ ئەم پزیشکە فشەیە. بەبێ ئەوەی پشکنینی خوێن و میز و سۆنارم بۆ بکات، دەرمانی بۆ نووسیم.

محەمەد کۆسەش وتی: پزیشکەکە پێی وتم (گورچیلەکانی چرکیان گرتووە، هەندێك وردە زیخی تێدایە، ئاو زۆر بخواتەوە دێتە خوارەوە). بۆ پرۆستاتەکەشت وتی (قەوارەکەی زۆر گەورە نییە، بە قەدەر دنکە نۆکێکە).

جادر کۆمبارسیش وتی: قسەی قۆڕ، نزیکەی دەساڵە سەردانی دکتۆرەکان دەکەم، دکتۆر نەماوە سەردانم نەکردبێ، هەر هەمویان دەڵێن قەبارەکەی گەورە بووە، دەبێ ناوەکەی هەڵبکۆڵین، کەچی ئەو دکتۆرە فاشیلە دەڵێ جێگەی مەترسی نیە!

منیش وتم: لە ورمێ کەسێك دەناسم، لەو هوتێلەی کە بۆی دەچین، نووسینگەی هەیە، نەخۆش دەباتە لای دکتۆرەکان، بەیانی دەچینەی لای و داوای لێ دەکەم لەگەڵمان بێت.

ئەوەبوو بەم شەوە گەڕاینەوە شاری ورمێ، لە ڕێگا تەلەفۆنم بۆ بەڕێوەبەری هوتێل (ئادا) کرد و پێم وت ژوورێکی سێ تەختیمان بۆ دابنێت.

هوتێل (ئادا) لە خیابانی کاشانیە، کەوتۆتە ناوجەرگەی بازاڕ، هوتێلێکی سێ ئەستێرەی زۆر خاوێنە. نرخەکەی لە چاو هوتێلەکانی تر زۆر کەمە. خەڵکی شاری هەولێر و دەورو بەری لە سەردانیان بۆ شاری ورمێ، لەو هوتێلە دەمێننەوە.

تا گەیشتینە ورمێ و چووینە هوتێل، کات دوانزەی شەوی لادابوو. ئەو شەو خەوتین و بەیانی کاتژمێر هەشتی بەیانی هەستاین و ریشمان تاشی و خۆمان گۆڕی و چووینە ریستورانتی هوتێلەکە بۆ نانخواردنی بەیانی. دوای نانخواردن، چاومان بە کەمال مزوری کەوت، لە نووسینگەی خۆی دانیشتبوو، چاوەڕێی نەخۆشەکانی دەکرد بیانباتە لای پزیشك. کەمال مزوری لە تەمەنی من و جادر

کۆمبارس دا بوو، بە ڕەچەڵەك خەڵکی کوردستانی عێراق بوو، لە ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ خانەوادەکەی بە هۆی شۆڕشی ئەیلوولەوە ئاوارەی ئێران دەبێت و تاکو ئێستاش لەوێ ماوەتەوە. خێزاندارە و کوڕە گەورەکەی لە هێنان و بردنی نەخۆشەکان بۆ لای دکتۆر، هاوکاری دەکات. کەسێکی ڕاستگۆ و بێ فرو فێڵە. پێشتر ئەو شوێنەی کاری لێ دەکات، سەر بە فەرمانگەی تەندروستی نووسینگەی سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بوو، بەڵام دوای سەرهەڵدانی ڕێکخراوی تیرۆرستی داعش و بە هۆی قەیرانی داراییەوە، نووسینگەکە بە فەرمی داخرا و لە ئێستادا بەڕێوەبەرەکەی بۆ خۆی کار دەکات.

سڵاوم لێ کرد و جادر کۆمبارسم پێ ناساند و وتم: جادر کۆمبارس چەندین نەخۆشی هەیە، لەوانە پرۆستات و گورچیلك و چاو کزی، بۆ سەردانی دکتۆر هاتووە، لەگەڵی برۆ بۆ لای دکتۆرە باشەکانی ئێرە، ئەو هاوڕێیەکی خۆشەویستمە.

کە وام پێ وت: بە مۆبایل پەیوەندی بە دکتۆرێکی پسپۆری نەخۆشیەکانی گورچیلك و میزەڵدان کرد و وتی: ئەم دکتۆرە لە سەرووی پسپۆرییەوەیە، ئەندامی کۆمەڵەی پزیشکانی ئەمریکی و بەریتانیایە و بەناوبانگە. جیاواز لە دکتۆرەکانی تر، بەیانیانیش نۆرینگەکەی دەکاتەوە، وتی ئێستا لەگەڵ خۆت بیهێنە.

منیش وتم: تا ئێوە دەچنە لای دکتۆر و دێنەوە، منیش دەچمە ئازمایشگای (ئاریان) و هەندێك پشکنین بۆ خۆم دەکەم.

جادر کۆمبارسیش وتی: تۆ چیتە، خۆ نەساغ نیت؟

وتم: پێشتر نەخۆشی کینگزم هەبوو، لە هەولێر چوومە لای دکتۆر شەوقی غەزالە، حەبی زایلۆریکی سێسەد ملیگرامی بۆ نووسیم. نزیکەی چوار ساڵ بەکارم هێنا و لە خواردنی گۆشتی سوور و

پاقلەمەنیەکان خۆم دوور خستەوە، ئینجا چاك بوومەوە. هەرچەندە چاك بوومەتەوە، سالی جارێك یان دوو جار پشکنینی خوێن دەکەم، بۆ زانینی رێژەی یۆریك ئەسید و کریاتین و پرۆتین لە ناو خوێنم.

ئیتر ئەوەبوو، کەمال مزوری و جادر کۆمبارس چوونە خیابانی شیمالی بۆ لای دکتۆر و منیش چوومە ئازمایشگا.

ئازمایشگای (ئاریان) لە هوتێل (ئادا) نزیك بوو، پشکنینم کرد و گەڕامەوە هوتێل. لە سالۆنی هوتێل دانیشتم و بە دەم چا خواردنەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی جادر کۆمبارسم دەکرد. محەمەد کۆسەش وتی: بە هۆی گەشتیارانەوە ئەم ماوەیە ئاگام لە مال و مندالم نەماوە، ئەگەر لاریت نەبێ، دەچمەوە خانێ و بەیانی دێمەوە لاتان.

منیش وتم: برۆ خوات لەگەل بێت، کە ئیشوکارمان لێرە تەواو بوو ئاگادارت دەکەینەوە.

بەم شێوەیە، محەمەد کۆسە گەڕایەوە خانێ و منیش تا کاتژمێری دووی دوای نیوەڕۆ چاوەڕێی جادر کۆمبارسم کرد، کە نەهاتەوە، چوومە ئەو ریستورانتە کە لەناو هوتێلەکە بوو، نانی نیوەڕۆم خوارد و گەڕامەوە ژوورەکەمان و دووشێکم وەرگرت و لێی خەوتم.

# بیمارستانی میلاد

بە تەواوەتی چاوەکانم گەرم نەکردبوون، لەگەڵ دەنگی تەلەفۆن بە ئاگا هاتم، کەمال مزوری لە سەر خەت بوو، وتی: خۆت بگۆڕەو وەرە خوارەوە، لە ئۆفیسەکەم چاوەڕێت دەکەم. جادر کۆمبارسیش لە لامە، لە بیمارستانی میلاد قەستەرەی پرۆستاتی بۆ دەکەن، بەهزادی کوڕم لەگەڵی دەچێت، پێم باشترە تۆشیان لەگەڵ بیت.

بە خێرایی خۆم گۆڕی و چوومە خوارەوە. کە جادر کۆمبارس چاوی پێم کەوت، وتی: کاك کەمال پێی خۆشە تۆمان لەگەڵ بیت، دەنا من حەزناکەم تۆ ماندوو بکەم.

منیش وتم: ئێمە براین، لە خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵتدام.

کەمال مزوریش وتی: نەخۆشێکی زۆر لە هەرێمی کوردستانەوە روویان لێرە کردووە، لەگەڵیان دەچمە کۆمەڵگەی پزیشکان، بۆیە ناتوانم لەگەڵتان بێم. بەهزادی کوڕم لەگەڵتان دێت، ئەویش وەکو من شارەزایەو ئەوەی پێویست بێت بۆتان دەکات.

ئەمەی وت و بانگی بەهزادی کرد و پێی وت: لە نەخۆشخانەی میلاد دکتۆر چاوەڕێتان دەکات، لەوێ قەستەرە و پشکنینی تەواو بۆ جادر کۆمبارس دەکرێت،لەگەڵیان برۆ تا کارەکانیان تەواو دەبێت لەگەڵیان بمێنەوە.

ئەوەبوو منیش لەگەڵیان چووم، کە گەیشتنە بیمارستانی میلاد، دکتۆر لە پرسگە چاوەڕێی دەکردین. کە چاوی بە جادر کۆمبارس کەوت، پێی وت: خۆت یەکلایی کردەوە، یان نا؟

ئەویش وتی: وەکو پێتم وتی: ئەگەر دەزانی هەڵاوسانی پرۆستاتەکەم مەترسی لە سەر ژیانم نیە، ئەو نەشتەرگەریە ناکەم و حەزناکەم هەڵیکۆڵن.

ئەویش وتی: دەزانم بۆچی ئەو نەشتەرگەرییە ناکەیت، لەوە دەترسیت توانای سێکسکردن لە دەست بدەیت؟

ئەویش بە پێکەنینەوە وتی: ئەدی هەقم نیە بترسێم؟

دکتۆریش وتی: هەموو پرۆستاتەکەت بۆ دەرناهێنم، تەنها ئەوەندەی لێ دەردێنم کە بۆڕی میزت فراوان بێت و کێشەت بۆ دروست نەکات، بەشی ئەوەندەت بۆ دەهێڵمەوە کە توانای سێکسکردنت بمێنێ.

جادر کۆمبارسیش وتی: دکتۆرەکانی هەولێریش هەمان قسەیان پێ وتومە، بەڵام ئەوانەی کە نەشتەرگەری پرۆستاتیان کردووە، دەڵێن توانای سێکسیمان نەماوە.

دکتۆریش وتی: حەبێکت بۆ دەنووسم، یارمەتی دەردەبێت بۆ هەڵسانی ئەندامی نێرینەت و هیچ مەترسیشی لە سەر ژیانت نابێت. یەك کاتژمێر بەر لە سێکسکردن دانەیەکی لێ بخۆ، وەکو گەنج کێرت هەڵدەستێت.

جادر کۆمبارسیش وتی: ئەگەر ئەم نەشتەرگەرییە نەکەم چی دەبێت؟

وتی: زوو یان درەنگ هەر دەبێ بیکەیت، بەڵام دەتوانی هەندێکی تریش دوای بخەیت.

ئەویش وتی: ئەگەر نەیکەم ئێستا چیم بۆ دەکەی؟

وتی: ئێستا بە نازوورت بۆ دەکەم، لە ناوەوە سەیری دەکەم بزانم چۆنە.

جادر کۆمبارس قەستەرەش وتی: منیش ئەوەم پێ باشە، چارەسەرم بۆ بنووسە، ئەگەر چاك نەبوومەوە، ئەوکات دەیکەم.

دکتۆریش بە بەهزادی وت: لەگەڵی برۆ پەڕاوەکانی بۆ جێبەجێ بکە و بیبە ژووری نەشتەرگەری، کە ئامادەبوون، ئاگادارم بکەوە، بە بەنجی مەوزوعی بۆی دەکەم.

جادر کۆمبارس لەگەڵ بەهزاد خەریکی جێبەجێکردنی پەڕاوەکان بوون، منیش لە هۆڵی چاوەڕوانی دانیشتم و چاوەڕێم کردن. دوای کاتژمێرێك جادر کۆمبارس هاتە لام و وتی: داوای لێبوردنت لێ دەکەم زۆر ئەزیەتم دایت.

منیش وتم: گرنگ ئەوەیە تۆ چاك بیتەوە و بە ساغ و سەلامەتی بگەڕێیتەوە ناو خانەوادەکەت.

بەهزادیش رووی لە جادر کۆمبارس کرد و وتی: دکتۆر بەشی دوو مانگ دەرمانی بۆ نووسیویت، وتی (دوای تەواو بوونی ئەو دەرمانانە، دەبێ بگەڕێیتەوەلامن تا پشکنینی بۆ بکەم) ئەگەر باشتر نەبێت، ناچاری نەشتەرگەریەکە بکەیت.

# کوچەی پلیتەن

گەڕاینەوە هوتێل و تەلەفۆنم لەگەڵ محەمەد کۆسە کرد و پێم وت: ئیش و کاری جادر کۆمبارسمان تەواو کردووە، ئەمڕۆ وەرە ورمێ، لە هوتێل چاوەڕێت دەکەین. دەچینە شاری مەهاباد و ئەم شەو لەوێ دەمێنینەوە.

جادریش وتی: زۆرم پێ خۆشە شاری مەهاباد، پایتەختی کۆماری کوردستان و شاری پێشەوا قازی محەمەد و محەمەدی ماملێ و هێمن و هەژاری موکریانی نەمر ببینم.

منیش وتم: هێمنی موکریانی ناوی خۆی محەمەد ئەمینی شێخولئیسلامە، لە ساڵی ١٩٢١ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٨٥ گیانی بە خاك سپاردووە و لە گۆڕستانی شاعیران لە شاری مەهاباد نێژراوە. لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان چەندین شیعری نەتەوەیی و وتاری سیاسیی بە نرخی لەو سەردەمەدا بڵاوکردۆتەوە و پێشەوا قازی محەمەدیش نازناوی شاعیری میللی پێ بەخشیوە.

جادریش وتی: زۆرم پێ خۆشە بچمە سەر گۆڕی ئەو نەمرانە و سەری رێز و نوازشیان بۆ دابنوێنم.

منیش وتم: پێش چەند ساڵێك بە تایبەتی بۆ سەردانی گۆڕی ئەو نەمرانە هاتم.ئۆتۆمبێلێکم گرت داوام لێی کرد بۆ سەر گۆڕی ئەوان بمبات. ئەو شوفێرەی ئێمەی بردە سەر گۆڕی ئەو نەمرانە، کوڕێکی گەنج بوو، دەرچووی دانیشگا بوو، وتی (زۆربەی شیعرەکانی هێمنی

موکریـانی و هەژاری موکریـانیم لەبەر کـردووە)، منـیش وتـم (دیـارە هەسـتی شـیعریت هەیە؟)، وتی (دەرچـووی بەشی کـوردیم، زۆر سەرسـامم بە شـیعرەکانی ئەو دوو کەلە شـاعیرە نەمـرەی گەلەکەمان).

جـادریش وتی: ئەو گۆڕسـتانەی کە ئەوانی لێ نـێژراون لـێرەوە دوورە؟

وتم: زۆر دوور نیە.

بە چاوتروکانێـك گەیشـتینە ئەوێ، دوای خوێنـدنی سـورەتی فـاتیحە، هەنـدێك وێنەمـان لەگەڵ گـرتن و دوایی لەگەڵ هەمـان شوفێر چووینە سەر گۆڕی قازی محەمەد و سەیفی قازی.

نـانی ئێوارەمـان خـوارد و لە سـاڵەی هـوتێلەکە چـاوەڕێی هـاتنی مـحەمەد کۆسـەمان دەکـرد. کە هـات، کلـیلی ژوورەکەمـان دایەوە بەرێزەبەری هـوتێلەکەو بە رێ کەوتـین. کە گەیشـتینە جێ، مـحەمەد کۆسە وتی: چی دەڵێن بتانبەم بۆ هوتێل کوێستان، یان خانوێکتان بۆ بگرم؟

منیش وتم: جیاوازییان چیە؟

وتی: ئەگەر حەزتان لە مێ بازی بێت، خانووتان بۆ دەگرم و ژنی جوانیشتان بۆ دێنم. ئەگەر نەشتانەوێ، دەتانبەم بۆ هوتێل.

جادریش تەماشایەکی منی کرد و لە شەرمان هیچ دەنگی نەکرد. لە چاوەکانیدا زانیم کە حەزی لێیە. رووم لە محەمەد کۆسە کرد و پـێم وت: ئەگەر دلنیایـت ئەو ژنـانەی بۆمـان دەهێنیـت جـوان و ناسکن، بیرۆکەیەکی خراپ نیە.

ئەویش وتی: بە دەست خۆمانە، چۆنتان بوێ وا دەبێت. ئێوە پارەی خۆتان دەدەن.

جادریش وتی: دکتۆر حەبی زەوقی بۆ نووسیوم، فرسەتێکی باشە، لێرە تاقی دەکەمەوە.

منیش بە پێکەنینەوە وتم: تۆ حەبی زەوقت پێیە بە ئێمە چی؟

وتی: ئەگەر بتانەوێ بەشی ئێوەشی لێ دەدەم.

محەمەد کۆسەش وتی: من لە ئێوە گەنجترم، پێویستم بە حەب نیە.

ئەمەی وت و مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و پەیوەندی بە کەسێکەوە کرد و شوقەیەکی لە کوچەی پلیتەن بۆ گرتین و وتی: ئەم شەو لێرە دەمێنینەوە و دەیکەینە شەوی سوور، تا بەیانی چەند ژنتان بوێ بۆتان دەهێنم، ژنی فارس و عەجەم و ژنی خۆمالیش هەیە.

جادریش وتی: گوێم لێ بووە دەڵێن (ژنی فارس سوور و سپی و باڵابەرز و جوانن) بۆ من ژنێك لەوانە بێنە.

محەمەد کۆسەش وتی: منیش ژنێکی عەجەم بۆ خۆم دێنم.

ئەمەی وت و رووی لە من کرد و وتی: ئەی تۆ کامیانت دەوێ؟

وتم: من ژنم ناوێ بۆ سێکسکردن، ژنێکی خۆمالیم دەوێ، لەگەڵم دابنیشێت و بە یەکەوە گفوگۆ بکەین.

محەمەد کۆسەش وتی: ئەو ژنانە حەزیان لە گانە، ئەگەر نەیگێیت بۆچیتە؟

وتم: گان هەموو شتێك نیە، دەمەوێ دڵی خۆیم بۆ بکاتەوە و باسی ژیانی خۆیم بۆ بکات، بۆچی ئەم ڕێگایەی هەڵبژاردووە.

جادریش وتی: خۆ تۆ توێژەری کۆمەڵایەتی نیت، تا بەدواداچوون بۆ ژیانی ئەم و ئەو بکەیت؟

منیش وتم: هەموو کەسێك کتێبێکی داخراوە، وەك ڕۆماننووسێك پێویستم بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەیە، تا بیانکەمە کەرەستەی ڕۆمانەکانم.

کە ئەمەم وت، محەمەد کۆسە ڕەنگی تێکچوو، بە شلەژاوییەوە وتی: بۆ خۆشی ئێوە نەبێت، ژن بۆ کەس ناهێنم، ئەگەر بمخەیتە ناو ڕۆمانەکانت و ناوم بێنیت، ئابڕووم دەچێت، دەبێ سەر هەڵگرم و لێرە بڕۆم.

جادریش ڕووی لە محەمەد کۆسە کرد و پێ وت: مادام ئەو بەشداریمان لەگەڵ ناکات، پێویست ناکات بیانهێنیت.

منیش وتم: مەترسن، ناوتان ناهێنم.

کە ئەمەم وت، محەمەد کۆسە ڕووی لە جادر کرد و وتی: کەواتە، کە گەیشتینە جێ، تەلەفۆنیان بۆ دەکەم و ناونیشانی شوقەکەیان پێ دەدەم و پێیان دەڵێم دوای نوێژی عیشا بێن.

جادریش وتی: تا ئەوکات ئێمەش دووشێك وەردەگرین و خۆمان پاك دەکەینەوە.

بەم شێوەیە، محەمەد کۆسە ئێمەی گەیاندە کوچەی پلیتەن و کلیلی شوقەکەی لە خاوەنەکەی وەرگرت و جانتاکانمان بردە سەرەوە و خۆمان گۆڕی.

پێش ئەوەی محەمەد کۆسە قسە لەگەڵ لەشفرۆشەکان بکات، پێم وت: لە بیری نەکەیت، ژنێکی خۆماڵی بۆ من بێنە، زۆر بە تەمەن نەبێت، چەند گەنج بێت هێندە باشترە.

ئەویش وتی: ژنێك دەناسم، زۆر ژنی لەبەر دەستە، هەر تایبەتمەندییەکت بوێ لای دەست دەکەوێ.

منیش وتم: پێی بڵێ یەکێکم بۆ بنێرێت کە تازە دەستی بەم کارە کردبێت.

محەمەد کۆسەش وتی: ئەو تایبەتمەندییەی کە تۆ دەتەوێ، نرخەکەی لەوانی تر گرانترە.

منیش وتم: خەمی ئەوەت نەبێ، هەرچەندی بیەوێ، پێی دەدەم. گرنگ ئەوەیە ژنێکم بەو تایبەتمەندییە بۆ بنێرێت کە دەمەوێت.

سەرەتا پەیوەندی بە پیاوێك کرد، داوای لێکرد دوو ژن، بە ناونیشانی شوقەکەمان، بۆ خۆی و جادر بنێرێت. پێشی- وت کە ژنێکیان فارس بێت و ئەوەی تریش عەجەم بێت. دوای ئەوە تەلەفۆنی بۆ ژنێك کرد و بە زمانی کوردی قسەی لەگەڵ کرد وتی: ئاغایەکم لایە، لە باشووری کوردستان هاتووە، ژنێکی دەوێ لەو کارەیدا نوێ بێت، ماوەیەکی زۆر نەبێت دەستی بە کاری لەشفرۆشی کردبێت.

تەلەفۆنەکەی دانایەوە و پێی وتم: تۆ دەبێ هەندێك چاوەڕێ بکەیت، ئەو ژنەی کە تۆ دەتەوێ، بەردەست نیە، تا ئامادەی دەکات، دەکەوێتە دوای کاتژمێر دەی شەو.

منیش وتم: پەلەم نیە، چاوەڕێی دەکەم.

جادر جانتاکەی کردەوە و پەشتەماڵێك و فانیلە و شۆرتێکی لە ناو دەرهێنا و لەگەڵ لیفکە و قالبێك سابوون، بە پێکەنینەوە وتی: دەچمە گەرماوەکە، بۆ شەوی سوور خۆم ئامادە دەکەم.

محەمەد کۆسەش وتی: بۆچی وا ناکەیت، ئەمڕۆ قەستەرەی کێرت کردووە و بۆڕیەکەت خاوێن کردۆتەوە، ئەو سەلکە پەنیرانەی چەند لەمێژە لە ناو جەستەت کۆبۆتەوە، هەمووی لە قوزی ئەو ژنە فارسەدا بەتاڵ دەکەیت.

ئەویش حەبەکەی کێر هەڵسانی لە ناو پاکەتەکە دەرهێنا و وتی: ئەو دکتۆرەی ئەو حەبەی بۆ نووسیم زۆر مەدحی کرد، ئەی نابێت تێستێکی پێ بکەم؟

ئەویش وتی: حەزدەکەیت تا بەیانی بۆ خۆت بیگێ.

تا جادر لە گەرماوەکە هاتە دەرەوە، منیش لەگەڵ محەمەد کۆسە چوومە خوارەوە، لە نزیك ئەو شوێنەی کە لێی دابەزی بووین، نانەواخانەیەکی لێ بوو، هەندێك کولێرەی گەرم و جامێك ماست و هەندێك ژاژی و پەنیرمان کڕی و گەڕاینەوە.

قۆریەکەم پڕ ئاو کرد و سێ مڵاك تۆچاشم تێ کرد و خستمە سەر ئاگر. کە محەمەد کۆسە ئەمەی بینی، لە شوێنی خۆی هەستا و قۆریەکەی داگرت و ئاوەکەی ناوی بەتاڵ کرد و وتی: ئێوەی عێراقی نازانن چای لێ بنێن، چۆن تۆچا و ئاو بە یەکەوە دەخرێتە سەر ئاگر. ئاخر بۆیە دانەکانتان رەش بووە.

منیش وتم: کەواتە خۆت لێی بنێ، بزانین ئێوە چۆنی لێ دەنێن.

ئاوی لە قۆریەکە کرد و لە سەر ئاگری دانا و وتی: کە ئاوەکە کوڵا، ئینجا تۆچای تێ دەکەین و دەمودەستیش ئاگرەکەی ژێری

دەکوژێنینەوە. یەك دوو خولەك بەجێی دەهێڵین، تا بۆ خۆی دێم دەدات، ئەوکات تێی دەکەین.

بەم شـــێوەیە، نــــان و چــــای ئێوارەمــــان خــــوارد و بە دەم میوەخــواردنەوە بــاسی سروشــتی رەنگیــنی شــارەکانی رۆژهەڵاتی کوردســتانی بـۆ کـردین وتی: ئەگەر یەك حەفـتە لـێرە بمێنـنەوە، ئەو شارانەتان هەموو پیٚ دەکەم.

منـیش وتـم: بـا بـۆ جـارێکی تـر بمێـنیٚ، تەنهـا دوو شـەو لـێرە دەمێنینەوە.

لەم قسـانەدا بـووین، زەنـگی مۆبـایلەکەی لێیـدا، هەڵیگـرت و قسـەی لەگەڵ کەسـێك کـرد. کە مۆبـایلەکەی داخسـت، رووی لە جــادر کۆمبــارس کــرد و وتی: دوای کــاتژمێرێکی تــر ژنە فــارس و عەجەمەکە دەگەنە لامان.

جــادر کە ئەمەی گــویٚ لیٚ بــوو، کیسـەی دەرمانەکـانی لە نـاو جانتـاکەی دەرهێنـا و پـاکەتی حەبی زەوقەکەی دەرهێنـا و دەنکێـك حەبی خـوارد و وتی: ئەوە ئەو حەبە بـوو کە دکتـۆر بـۆی نووسـیم، بزانم تا چەند سوودی دەبێت.

ئەمەی وت و دنکێکی تریشیـ دەرهێنا و پێی دام وتی: تۆش ئەم دنکە بخۆ، نەك حەزت بچێتە ئەو ژنەو بتەویٚ بیگێیت.

منیش وتم: بە قسـەت دەکەم دەیخۆم، هەرچەند ئیشیشم پێی نابێت.

مـحەمەد کۆسـەش بە پێکەنیـنەوە وتی: شـەرم مەکە، تـۆ پـارەی خۆت دەدەیت، تۆش وەکو جادر کۆمبارس بۆی تێبخە.

ئەمەی وت و یادگارییەکانی منداڵی خۆی بۆ گێڕاینەوە و باسی ژیانی لادێی ئەو سەردەمەی بۆ کردین، کاتێک شوان بووە و مەڕو ماڵاتی لەوەڕاندووە.

جادریش هیچ دەنگی نەبوو، لە سەر لاگونێك لێی راکشابوو، کێری هەستابوو، وەکو ماری کوبرا لە ژێر بەتانی سەری قیت کردبۆوە، کەوتبووە ناو دەریای خەیاڵ و بە خەیاڵی ئەو ژنە فارسەی کەبۆی دێت، دەستی پێدا دەهێنا.

کە ئەو دیمەنەم بینی، سەرم خستە ژێر گوێی محەمەد کۆسە و بە دەنگێکی نزم پێم وت: تەماشای جادر بکە، کەوتۆتە دەریای خەیاڵ و دەست بە کێری دادێنێت، لەوە دەترسێت تا ئەو ژنە دێت، کێری بنیشێتەوە و گانی پێ نەکرێت.

محەمەد کۆسەش کە ئەوەی بینی، رووی لە جادر کرد بە پێکەنینەوە پێی وت: مادام بە دەستەکانت کێرت رەق دەکەیت، بۆچی حەبی زەوقت خوارد؟

جادریش بە شەرمەزاریەوە دەستی لە ناو پێجامەکەی دەرهێنا و وتی: ئەو ژنانە مەوعیدیان تەواو نیە، دەترسم تا دێن، حەبەکە کاریگەریی نەمێنێ.

محەمەد کۆسەش وتی: خەمت نەبێ، ئەوان وەهات بۆ دەمژن، ئەگەر کێرت مردووش بێت، بۆت زیندوو دەکەنەوە، وەك مەترەقەی لێ دەکەن.

لەم قسانەدا بووین، لە دەرگا درا، محەمەد کۆسە دەرگاکەی کردەوە، ژنێکی باڵا بەرزی سوور و سپی چاو سەوز، پارچە قوماشێکی رەنگاو رەنگی بە سەری خۆی دادابوو، مانتۆیەکی رەشی لە سەر جلەکانی لە بەر کردبوو. کە هاتە ژوورەوە، سڵاوی کرد و پارچە

قوماشەکەی لە سەر پرچی فرێدا و مانتۆیەکەشی لە بەر کردەوە. پرچە زەردە زێڕینەکەی و مەمکە قیتەکانی بە دیار کەوتن، تەمەنی لە نێوان سی بۆ سی و پێنج سال دەبوو، پۆزی بە جوانی خۆی لێ دەدا، بە لار و لەنجە لێمان نزیك کەوتەوە و لە سەر کورسیێك دانیشت و وتی: هەندێك پەلە بکەن، تا خۆپیشاندان دەستی پێ نەکردووە، ئەم ناوە پڕە لە پاسدار و پیاوانی رژێم.

جادر کۆمبارسیش وتی: ئەم ئیشە بەو پەلە پەلەییە ناکرێت.

ئەویش وتی: مادام تۆ هەندە پەلەتە، ئێستا تۆ لەگەلم وەرە، کاری خۆت تەواو بکە، با ئەوانی تر دوای تۆ بێن.

محەمەد کۆسەش بە جادری وت: هەستە لەگەلی برۆ تا کێرت نەنیشتۆتەوە.

جادر قەستەرەش رووی لە ژنەکە کرد و وتی: ناوت چیە و تەمەنت چەندە؟

ئەویش وتی: ناوم شیرینە، تەمەنم سی و دوو سالە.

محەمەد کۆسەش بە پێکەنینەوە وتی: چ کارت بە نا و و تەمەنی ئەو هەیە، تۆ دەیگێیت، خۆ دەفتەری نفوسی بۆ دەرناهێنێت.

جادریش دەستی شیرینی گرت و بردیە ژووری خەوتن.

دوای هەندێك بووە دەنگە دەنگ لە ژوورەوە، هەردووکیان بە دەنگی بەرز قسەیان لەگەل یەکتری دەکرد، نەمزانی چی دەلێن. محەمەد کۆسەش لە شوێنی خۆی هەستا و چووە پشت دەرگاکە و هەستی خۆی راگرت، وتی: بزانم چی دەلێن.

لە پڕ لە قاقای پێکەنینی دا و وتی: ئەوەندەش دەستی بە کێریدا هێنا، کەچی گانی پێ ناکرێت.

منیش وتم: چۆن زانیت؟

وتی: گوێم لێ بوو شیرین پێی دەوت (کێر مردوو زووکە بیخە ناوی، تا شتێك رووی نەداوە، گانی خۆت بکە).

منیش وتم: ئەی جادر چی دەوت؟

محەمەد کۆسەش وتی: ئەویش دەیوت (ئەگەر دوا نەکەوتبایت، کێرم نەدەنیشتەوە).

ئەمەو لەو کاتەدا دەرگای ژووری خەوتن کرایەوە و هەردووکیان بە رووتی هاتنە دەرەوە. جادر کۆمبارس وەکو مزراح بە دەوری خۆیدا دەسوڕایەوە، دەتوت شتێکی لێ ون بووە بە دوایدا دەگەڕێت. شیرینیش رووی لە ئێمە کرد و وتی: یەکێکتان لەگەڵم بێتە ژوورەوە، پەلەمە.

محەمەد کۆسەش دەستی گرت و لەگەڵی چووە ژوورەوە. هەندەی پێ نەچوو، هەردووکیان هاتنە دەرەوە.

منیش وتم: جوو فسی نەکرد، چ زوو ئەو گانەت کرد؟!

وتی: خۆ من جادر نیم، بە حەبیش کێرم هەڵنەستێ!

جادریش وتی: کۆسەی گەواد توانجم لێ مەدە، من وەکو تۆ ساغ نیم، کۆمەڵێك نەخۆشیم هەیە.

منیش وتم: ئەو دەنگە دەنگەتان چی بوو لە ژوورەوە؟

ئەویش وتی: دەنگە دەنگی چی؟

محەمەد کۆسەش وتی: شیرین پێی دەوتی (کێر مردوو زووکە) تۆش دەتوت (چیبکەم کێرم نیشتۆتەوە و هەڵناستێ).

منیش بە پێکەنینەوە وتم: کەواتە گانت پێ نەکراوە، پارەکەت بە فیڕۆ ڕۆیشت؟

جادر کۆمبارسیش وتی: شیرین کە زانی کێرم هەڵناستێ، سپرایەکی لە ناو جانتاکەی دەرهێنا، کێرمی پێ تەعقیم کرد و بۆی مژیم تا ئاوی لێ نەهێنا لە دەمی دەرنەهێنا.

محەمەد کۆسەش وتی: ئەی بۆچی بە قوونی رووت دەسورێتەوە و شتێك لەبەر ناکەیت؟

ئەویش وتی: دەرپێی ژێرەوەم لە تەنیشت خۆم دانابوو، کە ئاوم لێهات، هەمووی رژایە سەر سینگ و مەمکەکانی شیرین، ئەویش دەستی دایە و خۆی پێ خاوێن کردەوە.

شیرین رووی لە من کرد وتی: واز لە قسەکردن بێنە، تا شتێك رووی نەداوە، لەگەڵم وەرە با تەواوی کەین.

منیش وتم: من گان ناکەم.

ئەویش وتی: ترسی کێر هەستانت نەبێ، وەکو ئەو کێر مردووەی تر بۆ تۆش دەمژم، تا ئاوی لێ نەهێنم، وازت لێ ناهێنم.

منیش وتم: وەکو پێم وتی من گان ناکەم و ناشمەوێ ئاوم بۆ لێ بێنیت. پارەی خۆت لەوان وەربگرە و برۆ مادام هێندە پەلەتە.

ئەوەبوو یەکی چوار سەد هەزار تومەنی لێ وەرگرتن و ڕۆیشت.

هێندەی پێ نەچوو، لە دەرگا درا، ژنە عەجەمەکە هات. ژنێکی رەنگ ئەسمەری بەژن کورتی پرچ رەشی چاو هەنگوینی بوو. لە شیرین گەنجتر بوو، رووخۆش و دەم بە پێکەنین بوو. سڵاوی لێ کردین و مانتۆکەی بەری فڕێدا و لە بەرامبەرمان دانیشت و وتی: ئاغا لە کەیەوە هاتوون؟

منیش وتم: ئەمڕۆ هاتووین، تەنها ئەم شەو لێرە دەمێنینەوە.

وتی: بۆچی زیاتر لێرە نامێننەوە؟

وتم: ئەم برادەرەم بۆ بۆ سەردانی دکتۆر هاتووە، منیش ماندوومە، حەفتەیەك لە ئەرمینیا بووم، ناتوانم زیاتر دوا بکەوم.

وتی: وەکو بیستوومە ژنانی ئەرمینیا ئازادن، حکوومەت لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکات.

منیش وتم وایە، کێ پێی وتی؟

وتی: هەندێك هاوڕێی ژنم هەن، بۆ ئیشکردن چوونەتە ئەوێ، دەڵێن لەوێ ئازادیە و پارەکەشی زۆرە.

منیش وتم: وایە، لەوێ نرخی خەوتن لەگەڵ ژن لە نێوان بیست و پێنج بۆ پەنجا دۆلاری ئەمریکییە.

کەوام وت، وتی: ئێمە تەنها چوار سەد هەزار تومەن وەردەگرین، کەچی دەڵێن زۆرە.

ئەمەی وت و رووی لە محەمەد کۆسە کرد و وتی: کامەتان لەگەڵم دێن؟

محەمەد کۆسەش رووی لە جادر کۆمبارس کرد و پێی وت: تۆ دەچیت، یان من بچم؟

ئەویش وتی: تۆ بڕۆ، منیش خۆم خاوێن دەکەمەوە و دوای تۆ دەچم.

بەم شێوەیە، هەردووکیان سێکسیان لەگەڵ کرد و پارەیان پێدا و بەڕێیان کرد.

کاتژمێر یانزەی شەو لایدابوو، بە محەمەد کۆسەم وت: تەلەفۆنێك بۆ ئەو ژنە بکە، بزانە بۆچی نەهات، ئەگەر زیاتر دوا بکەوێت با نەیەت.

ئەویش تەلەفۆنی لەگەڵ کرد و وتی: دەڵێ دوای نیو کاتژمێری تر دەگەمە لاتان.

زۆرم خەو دەهات، خۆم بە مۆبایلەکەم خەریك کرد، تا بووە دوانزەی شەو. بە محەمەد کۆسەم وت: پێی بڵێ با نەیەت، بە خۆراییش پێویستم پێی نیە.

ئەویش تەلەفۆنی بۆ کرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە. چەند جارێك پەیوەندی پێ کردەوە، بەڵام بێ سوود بوو.

جێگەمان راخست، خەریك بخەوین، لە دەرگا درا. محەمەد کۆسە دەرگای کردەوە، ژنێکی قەڵەوی کورتە بالای رەنگ ئەسمەر هاتە ژوورەوە، وتی: داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، بۆ دواکەوتنم.

منیش وتم: پێویست بە داوای لێبوردن ناکات، پێویستم پێت نیە، لە کوێ هاتوویت بگەڕێوە ئەوێ.

ئەویش وتی: ئاغا ئەگەر دەیبینی چ کچێکی جوان و ناسکم بۆت هێناوە، وا نالێیت.

ئەمەی وت و بانگی کچەکەی کرد وتی: ئایدە وەرە ژوورەوە.

کە سەرم هەلبڕی و تەماشام کرد، کچێکی گەنجی سپی و تەنکی ناو قەد باریك، جلی مۆدەی لە بەردا بوو، پارچە شالێکی بەسەر شان شۆڕ ببۆوە، کە فرەیدا، سینگ و مەمکی بە رووتی بەدیار کەوت. نێوان مەمکەکانی و سەر شانەکانی تاتۆ کردبوو. لە شەرمان ئارەقەی کردبۆوە، هاتە ژوورەوە و لە تەنیشت ژنەکە دانیشت.

منیش وتم: وتم وامزانی تۆ هەویت، بۆیە تورە بووم، بەڵام کە چاوم بەو کچە شۆخ و شەنگە کەوت، قسەم نەما.

ئەویش وتی: زوو زانیم کە بە هەلە لێم تێگەیشتوی، شوفێرەکەتان پێی وتم کا کامیان لە هەموویان گەنجتر و نوێ ترە لە کارەکە بۆت بێنم. بۆیە ئایدەم بۆت هێنا. ماوەیەکی کەمە دەستی بەم کارە کردووە. بێ لە ئەو، ژنێکی زۆرم لایە، هەرکاتێك ویستتان تەلەفۆنم بۆ بکەن، بۆتان دێنم. ئەمەی وت و ژمارەی تەلەفۆنەکەی پێ داین.

منیش بە ئایدەم وت: تۆ بڕۆ ژووری خەوتن، منیش دوای تۆ دێم.

کە چووم ئایدە جلەکانی لە بەر خۆی داکەندبوو، بە تەواوی خۆی رووت کردبۆوە، لە سەر تەختەی خەوتن لە سەر پشت لێی راکشا بوو، مەمکەکانی زۆر بچووك بوون، بە قەدەر فنجانێکی قاوە بوون، نەگەچرابوون، بە قیتی لە سەر سینەی راوەستابوون. گۆی مەمکەکانیشی وەکو مەمۆکەی مندالی ساوا، گەورە و سەرنج راکێش بوون. لە سەر شانەکانی و نێوان مەمکەکانی و سەر رانەکانی تاتۆی

کردبوو. هەروەها پیتی ناوی خۆی لە سەر پەنجەکانی تاتۆ کردبوو. لە شەرمان چاوەکانی بڕیبوونە بنمیچی ژوورەکە و سەیری منی نەدەکرد. تۆپێك بنێشتی کوردی خستبوە ناو دەمی، بە بێ دەنگی دەیجوی.

دەستم خستە سەر سینەی، هەندێك مەمکەکانیم بە نەرمی گوشی و پێم وت: ماشەڵا لەو جوانییە، کە خودا پێی داویت. بە حەلالی مێردت بکردبا و خێزانێکت پێکهێنتبا، لەو کارە قێزەونە باشتر نەبوو؟

وتی: چوار ساڵ پێش ئێستا لە تەمەنی پانزە ساڵی باوکم بێ ڕەزامەندی خۆم، منی لە پیاوێك مارە کرد. پیاوەکە حەڤدە ساڵ لە خۆم گەورە تر بوو، دوو ساڵ لەگەڵی ژیام، دوایی لێی جیا بوومەوە.

منیش وتم: بۆچی تەڵاقی دایت؟

وتی: ئەو تەڵاقی نەدام، لە دادگا داوای جیا بوونەوەم کرد.

وتم: بۆچی؟

بە دەم بنێشت جوینەوە وتی: لەگەڵ یەك نەگونجاین.

منیش وتم: کە لای ئەو بوییت، گانت دەدا خەڵك؟

وتی: نەخێر.

وتم: پیاوەکەت تێر گانی دەکردی؟

وتی: بەڵێ.

وتم: کەواتە بۆچی لێی جیا بوویتەوە؟

وتی: پێم وتی لەگەڵ یەکتر نەگونجاین.

وتم: بۆچی نەگونجان، لێی دەدایت؟

وتی: نەخێر.

وتم: دڵی لێت پیس بوو؟

وتی: نەگونجاین و تەواو.

له قسەکانی پێدەچوو نهێنیێکی زۆر گەورەی لە ناخیدا حەشار دابێت. زۆر هەوڵمدا پێی بدرکێنم، بەڵام نەیدرکاند. لە دڵی خۆمدا وتم (لەوانەیە پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ هەبوو بێت بۆیە دڵی نەکەوتۆتە سەر مێردەکەی و لێی جیا بۆتەوە).

پێم وت: پێش ئەوەی باوکت بە مێردت بدات، حەزت لە کەس نەکردبوو؟

کە وام پێ وت، تەماشایەکی منی کرد و هیچ دەنگی نەکرد.

منیش وتم: دە وابڵێ کەسێك لە ژیانتدا هەبووە، بۆیە لە پیاوەکەت جیا بوویتەوە.

زۆرم حەز لێ بوو چیرۆکی خۆشەویستی ئەوان بزانم، بۆیە لێم بووە مەراق و وازم لێی نەهێنا. دووبارە لێم پرسییەوە کەسێکی ترت خۆشویست وایە؟

هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و وتی: وایە هەم بوو.

وتم: لەکەیەوە خۆشت ویستووە؟

وتی: لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، کاتێك لە قوتابخانەی سەرەتایی بە یەکەوە دەمانخوێند خۆشم ویست.

وتم: ئێستاش یەکتریتان خۆشدەوێ؟

وتی: نازانم ئەو منی خۆشدەوێ یان نا، من تاك لایەنە ئەوم خۆشویستووە.

وتم: مەبەستت چییە لە خۆشویستنی تاك لایەنە؟

وتی: ئەو نەیدەزانی کە خۆشم دەوێ.

وتم: لەو کاتەوە تاکو ئێستا پێت نەوتووە کە خۆشت دەوێ؟

وتی: نەخێر.

وتم: بۆچی؟

وتی: نازانم.

وتم: مادام ئەو بە خۆشەویستی تۆی نەزانیوە، بۆچی لە پیاوەکەت جیا بوویتەوە؟

وتی: پێم نەوتی نەگونجاین.

هێندەی تر مەراقم کرد و دواندم تا گرێ کوێرەی دڵی خۆیم بۆ بکاتەوە، پێم وت: پیاوەکەت کەسێکی رەزیل و قرچۆك بوو؟

وتی: نەخێر.

ویستم بە شێوەیەکی تر هەست و سۆزی بجوولێنم و هۆکاری جیابوونەوەکەی پێ بدرکێنم. هەندێك دەستم بە پرچە زەرد و

ئاوریشـمییەکەی داهێنـا و نیـوچەوانیم مـاچ کـرد و وتـم: ئەو پیـاوە شتێکی خراپی لێ کردبوویت؟

دەتوت قسەکردن بە پارەیە، تەنها ورتەیەکی لێوە هات.

دەسـتم خسـتە سـەر سـینەی و هەنـدێك مەمـكە لیمۆییەکانیم گوشی و پێم وت: مەترسێ من کەسێکی خراپ نیم، سیخوڕیش نیم، پیاوی ئیتلاعات و پاسداریش نیم، ڕۆماننووسم و دەمەوێ ژیانی تۆ و ئەوانی دی بنووسمەوە.

بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: ئم!

هەر ئەو ئـمە بـوو، هـیچی تـری نەوت. لە دڵی خۆمـدا وتـم (ئەو بەستەزمانە نهێنیەکی گەورەی لە دڵیدا حەشار داوە، دیارە ناوێرێ بیدرکێنێت، بۆیە نایلێت).

هەندێك دەستم بە ڕوومەتە سپی و تەنکەکانیدا هێنا و وتم: تۆ کچـێکی زۆر جـوان و نـاوازەی، ئەگەر خـۆت نەتوتبـا، نەمـدەزانی مـێردت کـردووە. خـۆزگە ئەم کـارەت نەدەکـرد و مـێردێکی تـرت دەکردەوە.

کە ئەوەم پێی وت، هیچ دەنگی نەکرد. وتم: ئێستاش ئەو کوڕە دەبینیت کە لە مندالیەوە خۆشت دەویست؟

وتی: ناوە ناوە دەیبینم.

وتم: کە دەیبینی قسەی لەگەڵ دەکەیت؟

وتی: بەڵێ.

وتم: دواجار کە بینیت؟

وتی: شەش مانگ پێش ئێستا.

وتم: دەزانێت کە لە هاوسەرەکەت جیا بوویتەوە؟

وتی: نازانم.

وتم: بۆچی پێت نەوت کە خۆشت دەوێ؟

وتی: نازانم.

وتم: ئێستاش حەز دەکەیت هاوسەرگیری لەگەڵ بکەیت.

کە وام پێ وت، هیچ دەنگی نەکرد.

وتم: لە کەیەوە بە پارە گان دەدەیت؟

وتی: نزیکەی سێ حەفتەیە ئەم کارە دەکەم.

وتم: نازانیت کارێکی خراپە، بۆچی دەیکەیت؟

وتی: لە ناچاری دەیکەم.

وتم: بۆچی؟

وتی: دایك و باوکم بە رووداوی هاتووچۆ گیانیان لە دەست دا، من و برایەکی بچووکم مابووینەوە. ماوەیەك بە یەکەوە لەگەڵ باپیرم دەژیاین. کەسێکی بە تەمەن بوو، گورچیلەکانی تەمبەڵ بوون، چارەسەری نەکرد، تا وای لێهات خوێن و میزی تێکەڵی یەك بوون. ماوەیك لە بیمارستانی ئازربایجانی رۆژئاوا حەفتەی سێ جار بۆیان دەشوشتەوە، دوای ماوەیەك گورچیلەکانی بە تەواوەتی لە کار کەوتن و گیانی لە دەست دا.

منیش وتم: ئەی داپیرت لە ژیان ماوە؟

وتی: داپیرم لە ژیانـدایە، بـرا بچـووکەکەمی لەلایە، منـیش دوای مردنی باپیرم لێیان جیا بوومەوە و شـوقەیەکم لە شاری مەهاباد بە ملیۆنێك تومەن گرت و ئێستا بە تەنیا دەژیم.

وتم: پێت نەوتم بۆچی دەستت بەم کارە کرد؟

وتی: کــرێی شـــوقەکەم زۆر بـــوو، پـــێم نەدەدرا، رۆژێـــك لای هاورێیەکی سەردەمی منداڵیم باسم کرد، ئەم دەزانی کاری وا دەکات، پـێی وتـم (بـۆچی ئەو کـارە ناکەیـت و خـۆت لەم بێ پـارەییە رزگـار ناکەیـت). ئەوەبـوو مـنی بەو ژنەی ئێســتا ناســاند، ئەوە نــزیکەی مانگێکە ئەم کارە دەکەم.

منـیش وتـم: بێ لە مـن ئەمـرۆ لەگەڵ چەنـد پیـاو سـەرجێییت کردووە؟

وتی: پێش ئەوەی بێمە لای تۆ، لەگەڵ سێ پیاوی تر بوومە.

منیش وتم: کەوابێت پارەیەکی زۆرت دەستکەوتووە، بە رۆژێك دوو ملیۆن و چوارسەد تومەنت دەستکەوتووە؟

وتی: هەموو پارەکە بۆ من نییە، نیوەی ئەو پارەیە بۆ ئەو ژنەیە کە کاری لەگەڵ دەکەم.

منـیش وتـم: ئەگەر ئەو کـورەی کە خۆشـت دەوێ داوات لێ بکات گانی دەدەیتێ؟

وتی: نەخێر.

وتم: بۆچی؟

وتی: نازانم.

وتم: ئەوە نییە تۆ بۆ پارەگان دەدەیت، بۆچی گانیش نادەیت بەو؟

وتی: نازانم.

وتم: بۆچی لێمی دەشاریتەوە، شتێك بڵێ.

وتی: چی بڵێم.

وتم: ناکات تۆڵەی ئەوەی لێ بکەیتەوە کە نەهاتۆتە خوازبێنیت؟

وتی: ئەی پێم نەوتی تاك لایەنە خۆشم ویست، ئەو بێ ئاگا بوو لەوەی کە من خۆشم دەوێ.

ئەمەی وت و سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد و وتی: کاتەکە درەنگە و تۆش هێشتان جلەکانت دانەکەندووە، واز لەو پرسیارانە بێنە، ژیانی من هەمووی خەم و خەفەتە، تۆ هیچت بۆ من پێ ناکرێت، گانی خۆت بکە با بڕۆم.

کە وای وت، نیوچەوانیم ماچ کرد و پێم وت: من گان ناکەم، جلەکانت لەبەرکە.

ئەویش وتی: بۆچی ئەقڵت جوانی من ناگرێت؟

وتم: تۆ ژنێکی زۆر جوانیت، نامەوێ دەسکاریت بکەم، تەنها ویستم لە ژیانت بگەم.

کە وام پێ وت، جلەکانی لەبەر کرد و وتی: دەکرێ وێنەیەکت بۆ یادگاری لەگەڵ بگرم؟

وتم: ئاساییە.

ئەوەبوو بە مۆبایلەکەی خۆی وێنەیەکی سێلفی خۆم و خۆی گرت و بەیەکەوە هاتینە دەرەوە.

ئەو ژنەی کە لەگەڵی بوو، پێی وتم: ئەو هەمووکاتە چیتان دەکرد لە ژوورەوە، ئەم کچە جوانەم بۆ هێناوی، دەڵێی لوقمە، ناکات گانیشت پێ نەکرابێت؟

بەر لەوەی وەڵامی بدەمەوە، ئایدە لەجیاتی من وەڵامی دایەوە و وتی: بە رووتی لە بەر دەستی بووم، خۆی نیازی گانکردنی نەبوو، هەندێك پرسیاری لێ کردم، منیش وەڵامم دایەوە.

کە ئەمەی وت، ژنەکە شڵەژا، وتی: لەوەتی ئەم کارە دەکەم نەمدیوە ژن بۆ کەسێك بێنم، لەجیاتی ئەوەی بیگێێتن لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکات.

منیش وتم: هەقی دەکاتە چەند؟

وتی: شەش سەد تومەن.

کە پارەکەم دایە، نیوەی بۆ خۆی گێڕایەوە و نیوەکەی تریشی دایە ئەو.

پێم وت: پێشتر گوێم لێ ببوو، دەیانوت لە ئێران هاوسەرگیری کاتی و زۆر شوێنی رابواردنی لێیە، بەڵام هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم، ئەم دیاردەیە شارەکانی رۆژهەڵاتیشی گرتبێتەوە.

وتی: پێت وایە لای ئێوە شتی وا نییە؟

وتم: بڕوا ناکەم.

وتی: دەیان بەرپرس و کەسی دەولەمەندی لای ئێوە دەناسم، بۆ فرەدانی کۆرپەی ئەو ژنانەی کە سکیان پڕ کردوون، یان بۆ تەسک کردنەوەی قوزی هاوڕێ ژنەکانیان و بۆ نەشتەرگەری گونیان تا منداڵیان نەبێت، دێنە لام و دەیانبەمە لای پزیشك. ڕووداوێکت بۆ دەگێڕمەوەن لەوانەیە بڕوا نەکەیت و بڵێی خۆت دروستت کردووە.

وتم: با گوێم لێ بێت ئەو کات قسەم دەبێ.

وتی: ژنێك لە شاری هەولێر دەناسم، وەزیفەیەکی گەورەشی لە حکوومەت هەیە، ناوە خۆی ۆ دۆستەکەی دێنە ئێرە، خانوویان بۆ دەگرم، چەند شەوێك بەیەکەوە دەمێننەوە. ئە ژنە هاوسەرگیری کردووە و پیاوی خۆی هەیە. جارێك لەگەڵ پیاوەکەی هاتبوون. بە نهێنی بە پیاوەکەیم وت (ژنەکەت دۆستی هەیە، خیانەتت لێ دەکات) پیاوەکەی بێ ئەوەیخۆی تێکبدات، بە ئاسایی وتی (مەبەستت حەمەیە؟) منیش وتم (بەڵێ مەبەستم حەمە دۆمە، دیارە تۆش دەیناسیت؟) وتی (ئەوان هاوڕێی یەکن، ژنەکەم دڵی پێی خۆشە، خۆم ڕێگام پێ داوە).

منیش وتم: قسەیەك بکە بچێتە ئەقڵەوە.

ڕووم لە جادر کۆمبارس و محەمەد کۆسە کرد و وتم: بۆ من مەڵێن، بۆ خوا بڵێن، شتی وا دەبێت؟

محەمەد کۆسەش ڕووی لە ژنەکە کرد و پێی وت: نەمدیوە کەسێك ژنی خۆی بەگان بدات و بەلاشیەوە ئاسایی بێت.

ژنەکەش وتی: دەمزانی بڕوام پێ ناکەن، ئێستا تەلەفۆنی بۆ دەکەم و لە بەرچاوی ئێوە قسەی لەگەڵ دەکەم و پێی دەڵێم باسی حەمە دۆمم بۆ بکات.

ئەمەی وت و بە واتسئاب پەیوەندی بە ژنێك کرد و کامێراکەشی کردەوە. ژنێکی باڵا بەرز و سوور و سپی، مەمکەکانی دەتوت گندۆرەی تێر ئاون، هێندە گەورە بوون، مەکسیێکی سووری تەنکی لە بەر دابوو، لە تەنکییان دەرپێ کورتەکەی لە ناوی دیار بوو. لە ئەحوالی پرسی و وتی: خۆت و پیاوە گەوادەکەت چۆنن، بۆچی ماوەیەکە لەگەڵ حەمە دۆمی دۆستت دیار نین؟.

ئەویش وتی: لە ترسی خۆپیشاندانی جەماوەری نەهاتین، ئەگەر بارو دۆخی ئەو ناوە هەندێك ئارام بێتەوە دێین.

ئەویش وتی: دوو ئاغام لەلایە، لە شاری هەولێرەوە هاتوون، نایانناسیت؟

ئەمەی وت و رووی کامێراکەی لە ئێمە کرد و وتی: ئەم دوو ئاغایەن.

ئەویش سڵاوی لێکردین و ناونیشانی شوێنی کارکردنی خۆی پێ وتین و وتی: هەر کارێکتان هەبێت لە خزمەتتان دام.

منیش پێم وت: نامانەوێ ئەزیەتت بدەین.

کە وام پێی وت، ماکسیەکەی خۆی هەڵدایەوە و بە توندی شاپێکی لە قوزی خۆی دا و وتی: ئەزیەتی چی، بەم قوزە بۆتان دەکەم.

کەوای وت، رووم لە ژنە گەوادەکە کرد و پێم وت: ئێمە لە گوێی گادا نووستووین، هەرچی بلێی بڕوات پێ دەکەم.

## مەزاری حەسەن زیرەك

نانی بەیانیمان خوارد و لەگەڵ محەمەد کۆسە بۆ سەر گۆڕی حەسەن زیرەك لە شاری بۆکان بەڕێکەوتین. هەرچەند دوو جاری تریش چووبوومە سەر گۆڕی حەسەن زیرەك، بەڵام پێم خۆش بوو جارێکی تریش سەردانی بکەم.

پێش نیوەڕۆ گەیشتینە سەر گۆڕەکەی، وەخت بوو نەیناسمەوە، گۆڕانکارییەکی زۆری بە سەر هاتبوو. جاری پێشوو کە هاتم کێوی ناڵەشکێن لە دەرەوەی شار بوو، چواردەوری چۆڵ بوو، بەڵام ئەم جارەیان کەوتبووە ناو جەرگەی گەڕەك و چواردەوریشی۔ ماڵ بوو. پێشتر تەنها گۆڕی حەسەن زیرەکی لێ بوو، بەڵام ئێستا گۆڕی قاڵە مەڕەی شمشاڵ ژەن و شاعیرێکی خەڵکی بۆکانیشی۔ لێ بوو. هەندێك دار و درەخت و گوڵی جوانی لێ چاندرابوو، بە چیمەنی سەوز دەورە درابوو، هەروەها هەندێك کورسی دانیشتنیش لە دەوری چیمەنەکە بۆ دانیشتنی گەشتیاران داندرابوو، وەکو پارکێکی خنجیلانەی لێ کرابوو.

جادر کۆمبارس کە چاوی بە گۆڕی حەسەن زیرەك کەوت، مۆبایلەکەی دایە دەست محەمەد کۆسە و پێی وت: وێنەیەکم لەگەڵ گۆڕی حەسەن زیرەك بۆ بگرە، وابکە نووسینی سەر کێلەکەشی بە تەواوەتی دیار بێت.

منیش چوومە سەر گۆڕی قاڵە مەڕە و وێنەیەکی سێلفیم لەگەڵ گرت، ویستم بگەڕێمەوە لای جادر و محەمەد کۆسە و وێنەیەکیش

لەگەڵ گـۆڕی حەسـەن زیـرەك بگـرم، کە ئـاورم دایەوە، عەبـدوڵا شـێخانیم لە ژێـر دارێك بیـنی، لە سـەر پارچە مەقابایەك خەوی لێ کەوتبوو. بانگی جادرم کرد و پێم وت: سەیری ئەم پیاوە بکە لە ژێر ئەم دارە خەوی لێ کەوتـووە، ئەوە عەبـدوڵا شـێخانییە، یـان مـن چاوم رەشکە و پێشکە دەکات!

تەماشـایەکی کـرد و بە سـەر سـوڕمانەوە وتی: خـۆ بە راسـتی ئەوە عەبدوڵا شێخانییە، ئەوە بۆ لێرە خەوتووە؟!

لـێی نزیـك بـووینەوە و بانگمـان کـرد، (عەبـدوڵا هەسـتەوە)، کە گـوێی لە دەنـگی ئێمە بـوو، لە خەو هەڵسـایەوە، کە ئـێمەی بیـنی، لە خۆشیان وەخت بوو باڵ بگرێت و بفڕێت. باوەشی پێدا کردین و لە پـڕمەی گریـانی دا، بە چـاوی پـڕ لە فرمێسـکەوە وتی: کـاڵێ بۆکـانی مێردی پـێ نەکـردم، براکانی زۆریان لێ دام و بە درەنگی شـەو فڕەیان دامە سەر شەقام.

منیش وتم: ئەدی ماهیر کرمانجت لەگەڵ نەبوو؟

وتی: ئەویش پشتی تێ کردم و بە جێی هێشتم.

جادریش وتی: بە وردی بۆمان باسکە چی روویداوە؟

وتی: خـۆت دەزانی چەنـد سـاڵێکە ئەو کاڵێ بۆکـانییە بەنـدیێژەم خـۆش دەوێ، بەڵێـنی پـێ دابـووم کە هاوسـەرگیریم لەگەڵ بکـات. منـیش لەگەڵ مـاهیر کرمـانج هـاتین بـۆ خـوازبێنی. مـاهیر وتی (لە شـاری ورمێ هەنـدێك کـارم هەیە، تـۆ بـڕۆ لای منـیش دوایی دێـم. ئەوەبـوو دوێـنێ هـاتمە بۆکان و چـوومە ماڵیـان و داوای دەسـتیم لە براکانی کرد. براکانی وتیان بەو مەرجە خوشکی خۆمانت پێ دەدەین، دەبێ لێرە خانوێکی بۆ بکڕیت و لە سەر ناوی دابنێیت.

عەبدوڵا شێخانی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەردەوام بوو لە گێڕانەوەو وتی: پشت ئەستوور بووم بەو هاوڕێیەم، چونکە کەسێکی خوا پێداو و دەوڵەمەندە، بۆیە لەگەڵیان چوومە نووسینگەیەکی فرۆشتنی خانوو بەرە و خانوێکم بۆ کری. وتم بەیانی هاوڕێیەکەم دێتە ئێرە و پارەکەم لەجیاتی دەدات.

جادر کۆمبارسیش وتی: ئەم ماهیر کرمانجە تەقە بە فلسەوە دەنێت، چۆن پارەی خانووێکت لەجیاتی دەدات؟

ئەویش وتی: چاکەم بە سەرییەوە هەیە، بۆیە لێم رادەبینی. بیرتە جارێکیان یەك ملیۆن دینارم لە تۆ وەرگرت کتێبێکم لە سەر خەرجی خۆم بۆی چاپکرد؟

جادریش وتی: باشم لەبیرە، بە هەردووکتان کڵاوتان لە سەری من نا، نەتۆ پارەکەت دامەوە نە ئەویش.

کەوای پێ وت، سەری خۆی شۆڕ کرد و هیچ قسەیەکی نەکرد.

منیش وتم: پێت نەوتین دوایی چی روویدا؟

عەبدوڵا شێخانیش وتی: درەنگی شەو ماهیر کرمانج گەیشتە بۆکان و هاتە لامان، کالێ بۆکانی بەندیێژ پێی وت (عەبدوڵا شێخانی خانووێکی بۆ کڕیوم، هێشتان پارەکەی نەداوە، گوایە تۆ پارەکەی لەجیاتی دەدەیت). لەجیاتی قسەکەم پشتڕاست بکاتەوە و پشتگیریم لێ بکات، منی بە درۆ خستەوە و کۆمەڵێك قسەی ناشیرینیشی پێ وتم.

جادر کۆمبارسیش وتی: دەستی خۆشبێت، ئەگەر تۆ بە پارەی من کتێبت بۆی چاپ نەکردبا، ئێستا بێڕێزی پێ نەدەکردیت.

منیش وتم: کە پارەکەی لە جیاتی نەدایت، کاڵێ بۆکانی هەڵوێستی چی بوو؟

وتی: کە کاڵێ بۆکانی ئەوەی گوێ لێ بوو، خۆی و براکانی چی خراپە پێیان کردم و بەو شەوە درەنگە لە ماڵی خۆیان دەریان کردم.

منیش وتم: کەواتە لە دوێنێ شەوەوە لێرە خەوتوویت؟

وتی: هیچ شوێنێك نەبوو بۆی بچم و کەسیشم لێرە نەدەناسی، بۆیە ناچار بووم لە سەر مەزاری حەسەن زیرەك بخەوم.

منیش وتم: بۆکان شارێکی گەورەیە، ئەگەر هوتێلیشی لێ نەبێت، شوقەی بەکرێدانی لێیە، بۆچی شوقەیەکت بەکرێ نەگرت؟

وتی: پارەم کەم پێ بوو، بەشی گرتنی هوتێل و شەقەی نەدەکرد.

جادریش وتی: ئەگەر ئێمە نەهاتباینە سەر گۆڕی حەسەن زیرەك تۆ چیت دەکرد؟

وتی: ئێوە فریاد رەسن، خودا ئێوەی بۆ من ناردووە، ئەگەر نەهاتبان دەبوو بە زەلیلی لێرە بم و چاوم لە رەحمی خودا بێت، دەرگایەکم بۆ بکاتەوە.

منیش وتم: ئاوێك بە دەموچاوت دابکە و خۆت کۆکەوە، لەگەڵ ئێمە وەرە. ئۆتۆمبێلمان گرتووە، دەمانباتە شاری بانە، شەوێك لەوێ دەمێنینەوە، دوایی دەچینە شاری سەردەشت و لەوێشەوە بۆ شاری خانێ و لە مەرزی حاجی ئۆمەران دەگەڕێینەوە شاری هەولێر.

کە وام پێی وت، لە خۆشیان ئاو بە دەمی رانەدەوەستا، چووە ئاودەست، خۆی بەتاڵ کرد و ئاوی بە دەموچاوی داکرد و هاتەوە

لامان. جادریش بە پێکەنینەوە پێی وت: ئەوەی پارەی من بە ناهەق بخوات، خودا تۆڵەی منی لێ دەکاتەوە و ئەوها گەڕی دەکات.

ئەویش وتی: ئێمە براین، پارەی تۆ هی کێیەو هی من هی کێیە؟

ئەویش وتی: ئەوە یەکەمجار نیە تۆ پارەی من دەخۆیت، چەندجاری تریش پارەت بە قەرز لێ وەرگرتووەو دوایش نەتداومەتەوە.

منیش وتم: ئێستا کاتی گلەیی و گازاندە نییە، عەبدولا بۆ خۆی پەرپوت بووە و وەکو رێوی لەڕی لێ هاتووە، ئەگەر ئێمە بە کەڵکی نەیەین ئەی کێ بە کەڵکی دێت.

جادریش رووی لە عەبدولا شێخانی کرد و بە پێکەنینەوە پێی وت: بڕۆ سواری ئۆتۆمبێل بە، بە خێری خۆمان نانێکت بۆ دەکڕین و لەگەڵ خۆمان دەتبەینەوە هەولێر.

پێش ئەوەی بگەینە ناو شاری بانە، لە چۆمێکدا ریستورانتێکی خۆشی لێ بوو، لاماندایە ئەوێ و دوو ماسی سەر رەژوومان داواکرد. تا ماسیەکان ئامادە بوون، لە ژێر دار گوێزە بلندەکانی ئەو چۆمە دانیشتین و هەندێك وێنەمان گرت و عەبدوللا شێخانیش حەیرانی بۆ گوتین تا ماسییەکان هات لە گوتن نەوەستا و خەمی دابڕانی لە کالێ بۆکانی پێ دەڕەواندەوە و ناوە ناوەش محەمەد کۆسەش بە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەك و ماملێ لێی وەردەگرتەوە، تا ماسییەکان هاتن ئاگامان لەو دونیایە نەمابوو تەواو دابڕابووین.

دیار بوو جادر کۆمبارسیش بەرامبەر عەبدولا شێخانی زۆری لە دڵدا بوو، پێی وت: ئەوجە ئاقڵ بەو واز لە فرت و فێڵ و ساختەچیاتی بێنە. مادام پارەت نییە، بۆچی داخوازی کچی خەڵك دەکەیت.

منیش وتم: لە وە سەرم سوڕماوە عەبدولا شێخانی لە هەولێر و کالێ بۆکانی بەندیێژ لە بۆکان، چ شتێك ئێوەی بەیەك گەیاندووە وا بێیتە خوازبێنی؟

عەبدولاش وتی: خۆشم دەویٚ، سالێك پێش ئێستا لە هەولێر دەعوەتم کرد و لە گەڕەکی عەرەبان خانووێکم بۆی گرت، ماوەی سالێك کرێکەم بۆی دا، کەچی بۆ پارە منی فرۆشت و میردی پێ نەکردم.

جادریش وتی: دەشتویست من مۆبایلێکی ئایفۆنت بۆ بکڕم تا بە دیاری بۆی بێنیت.

منیش وتم: بە راستیتە؟

وتی: ئەگەر بڕوام پێ ناکەیت، لە خۆی بپرسە.

بە عەبدولا شێخانیم وت: ئەوە راستە؟

کە وام پێی وت، سەری خۆی داخست و هیچ دەنگی نەکرد.

بە هەرحال، نانی نیوەڕۆمان لەو ریستورانتە خوارد و بەرەو شاری بانە بەڕێ کەوتین. دوای نوێژی ئێوارە گەیشتینە شاری بانە و لەوێ شوقەیەکمان بە کرێ گرت و شەوێك لەوێ ماینەوە. نانی بەیانیمان لەوێ خوارد و دوایی بەرەو شاری سەردەشت بەڕێ کەوتین. لە سەر رووباری سیروان و بەنداوی سەردەشت هەندێك وێنەمان گرت و دوایی بەرەو شاری خانێ و مەرزی تەمرچین و حاجی ئۆمەران رۆیشتین.

کە گەیشتینە مەرزی تەمرچین، شوفێرەکانی مەرز بە محەمەد کۆسەیان وت: لە کوێ دێیتەوە؟

وتی: ئەم ئاغایانەم بردبووە شاری بانە، دوێنێ شەو لەوێ بووین، ئەمڕۆ بەیانیش چووینە شاری سەردەشت و بەڕێگای ئەوێ گەڕاینەوە.

یەکێك لە شوفێرەکان وتی: لە بانە و سەردەشت چ باس و خواسە؟

وتی: هیچ لە گۆڕێ نەبوو.

ئەویش وتی: دوێنێ شەو حکوومەت پاسدارێکی زۆری بۆ شاری خانێ هێنابوو، خۆپیشاندەرانیان دایە بەر دەستڕێژی گوللە و یانزە کەسیان شەهید کرد و نزیکەی چوار سەد کەسیشیان بریندار کرد.

کە ئەوەی گوێ لێ بوو، ڕەنگی تێکچوو، پەیوەندی بە ژنەکەی کرد و پێی وت: ئێوە سەلامەتن؟

ژنەکەشی وتی: گولەیەك بەر رانی کچە بچووکەکەمان کەوتووە، بەڵام خۆش بەختانە، مەترسی لە سەر ژیانی نییە و براکانت فریای کەوتن و بردیانە بیمارستانی نەغەدە و فیشەکەکەیان لە ناو رانی دەرهێنا، ئێستا تەندروستی باشە.

ئیتر هاتینەوە و ئاودیو بووین و عەبدوڵلا شێخانیشمان رزگار کرد و گەیاندمانەوە ئەم دیوی خۆمان.

جادر کۆمبارس ئۆتۆمبێلەکەی لە گەراجێك لە حاجی ئۆمەران راگرتبوو، کە لە مەرزی حاجی ئۆمەران پەڕینەوە، بە تاکسیێك چوینە گەراجەکەو جانتاکانمان خستە ناو ئۆتۆمبێلەکەی و گەڕاینەوە شاری هەولێر.

لە رێگاشــناوە نــاوە پشــوومان دەدا، عەبـدوڵلا شـێخانی رێگـا دوورەکەی نێوان حاجی ئۆمەران و هەولێری بە حەیران چڕین و ناوە نــاوەش چــیرۆکی خۆشەویســتی خــۆی دەگەڵ کــاڵێ بۆکــانی بــۆ دەگێڕاینەوە. ئەمەش بووە هەوێنی رۆمانێکی تر کە سەربردەی پڕ لە سەمەرە و زەبۆکی ژیانی ئەو پیاوە لە نێوان هەولێر و بەغدا و بۆکان و چۆنیەتی گرتنی و بەربوونی لە زیندانەکانی ئەمن لە سەردەمی رژێمی بەعس و سەردەمی دوای راپەڕین و تا رۆژگاری ئەمڕۆی شکستی خۆشەویستییەکەی و رەتکردنەوەی هێنانی کاڵێ بۆکانی و دەیان چــیرۆکی بە ســەلیقەی تــر دەکەونە نــاو تیمــای رۆمــانەکە..... چاوەڕوار بن.

***

**چیرۆک نووس و رۆمان نووس (کەمال سەعدی):**

- ساڵی ١٩٥٦ لە شاری هەولێر لە دایکبووە.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆس، ماستەر و دکتۆرای لە یاسا دا هەیە.
- دەیان کتێبی چاپکراوی لە بواری یاسا، ئەدەب و ڕۆشنبیری دا هەیە.
- دەیان بابەتی ئەدەبی و رۆشنبیری و یاسایی لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاو کردۆتەوە.
- ئەندامی [یەکێتی نووسەرانی کورد و سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان]ە.

==============================

**ئەو کتێبانەی نووسەر چاپی کردوون لە بواری چیرۆك و ئەدەب دا:**

- **شەش کورتە چیرۆکی کوردی**/ هاوبەش، هەولێر چاپخانەی شارەوانی، ١٩٧٦.
- **ون بوون**/ کۆمەڵە چیرۆك، هەولێر چاپخانەی وەزراەتی رۆشنبیری،١٩٨٤ .
- **دەرگا**/ کۆمەڵە چیرۆك، بەغداد چاپخانەی الزمان، ١٩٩٠.
- **سەعید زەبۆکی لای خۆمان**/ رۆمان، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، ١٩٩٧.
- **ترحێو**/ کۆمەڵە چیرۆك، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠٠٠.
- **فەنتازیا**/کۆمەڵە چیرۆك ، هەولێر بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، ٢٠١٠.
- **مەملەکەتی رۆبۆتەکان**/ چاپخانەی منارە-هەولێر، ٢٠١٧
- **بیرەوەریی جەنگاوەرێك**/ رۆمان، چاپخانەی تاران، ٢٠١٨.
- **خانمباز**/ رۆمان، چاپخانەی منارە لە شاری هەولێر، ٢٠١٩.
- **حەج و عومرە**/ رۆمان، چاپخانەی تاران، ٢٠١٩.
- **رۆژگارە تارێك و دژوارەکان** - رۆمان، چاپخانەی تاران، ٢٠١٩.
- **تریفەی مانگەشەو**/ کۆبەرهەمی چیرۆك، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای موکریان بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی تاران، ٢٠٢٠.
- **شەوانی باکۆ**/ رۆمان، چاپخانەی تاران، ٢٠٢٠.
- **رۆمانی قرچۆك**/ دەزگای موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی هێڤی، ٢٠٢٣.